# هەڵە باوەکانی

## دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان

محەمەد ساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)






هۆکارەکانی

زیانەکانی

چارەسەرەکانی

بەرگی دووەم

٢٠١٦

ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان

نووسینی: محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

هەڵگەری: نووسەر

دەرهێنانی هونەری: یعقوب قادر پیرۆت

بەرگ: شێرکۆ ئەحمەد

بەرگی: دووەم

چاپی: یەکەم

نرخ: ٣٥٠٠ دینار

تیراژ: ١٠٠٠دانە

ساڵی: ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردن( ٦١٨ )ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە

# ناوەڕۆک

دەستپێك ........................................ ٧
ستەمکردن لە منداڵ ........................................ ١١
نەبوونی متمانە لە نێوان دایك و باوك و منداڵ ........................................ ١٥
پرس و ڕاوێژ نەکردن بە منداڵ ........................................ ١٩
شەڕ و دەمەقاڵێی دایك و باوك لە پێش چاوی منداڵ ........................................ ٢٣
هەڵبەستنی تۆمەتی بێبنەما بۆ منداڵ ........................................ ٢٧
ئاشنانەکردنی منداڵ بە ئادابەکانی ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی ........ ٣١
دابین نەکردنی پێداویستییە ماددیەکانی منداڵ ........................................ ٣٣
فێڵ لە منداڵ کردن و شاردنەوەی ڕاستییەکان ........................................ ٣٥
لاساییکردنەوەی خەڵکانی دیکە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵدا ........ ٣٨
پشتگوێخستنی کێشە و ئارێشەکانی منداڵ........................................ ٤٣
ڕووخاندنی ورەی منداڵ ........................................ ٤٩
خۆدزینەوە لە وەڵامی پرسیارەکانی منداڵ ........................................ ٥٣
زایەکردنی سپاردە ........................................ ٦٣
زیاد لە حەد بەرگریکردن لە منداڵ ........................................ ٦٧
هەم گەزیان بەدەستە، هەمیش مەقەس ........................................ ٧٠
بێبەشکردنی منداڵ لە مافی ئاخاوتن ........................................ ٧٤
دوورکەوتنەوەی باوك یان دایك یان هەردووکیان بۆ ماوەیەکی دوور و
درێژ لە ماڵەوە ........................................ ٧٨
جێبەجێکردنی گشت داواکارییەکانی منداڵ ........................................ ٨٣
سپاردنی منداڵ بە قوتابخانە ........................................ ٨٧
ڕێگەدان بە منداڵ بۆ ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە دەرەوە بمێنێتەوە ........ ٩١

ستایش نەکردنی منداڵ لە کاتی ئەنجامدانی کاری چاکە ........................ ٩٥
گۆشەگیرکردنی منداڵ ........................................................................ ١٠٠
بەرتیلدان بە منداڵ ........................................................................ ١٠٥
زیاد وابەستەکردنی منداڵ بە خۆیانەوە ........................................................ ١٠٨
کارکردن بە منداڵ بەمەبەستی خۆدەوڵەمەندکردن .......................................... ١١١
نادیدەگرتنی هەستەکانی منداڵ .............................................................. ١١٥
ئاشنانەبوونی دایکان و باوکان بە زیانەکانی تەکنەلۆجیای سەردەم ........ ١١٨
ترۆکردنی منداڵ ............................................................................... ١٢٣
نەبوونی هەماهەنگی و یەك هەڵوێستی لە نێوان دایك و باوك .............. ١٢٦
پشتبەستن بە کەسانی دیکە لە پەروەردەو فێرکردنی منداڵدا ................ ١٢٩
بێبەشکردنی منداڵ لە مافی خوێندن و فێربوون ................................... ١٣٢
گوێ نەدان بە ترسەکانی منداڵ .............................................................. ١٣٥
گوێ نەدان بە تەندروستی منداڵ ............................................................ ١٤٠
تووڕەیی و ڕووگرژی دایك و باوك لە ماڵەوە ............................................. ١٤٤
هار و هاجکردنی منداڵ ...................................................................... ١٤٩

# دەستپێک

## بەناوی خودای مەزن و دلۆڤان

ئەڵبەتە خێزان بەیەکەم دامەزراوەی پەروەردە هەژمار دەکرێت لە جیهانی مرۆڤایەتیدا، چونکە ڕۆڵێکی گەورە و سەرەکیی هەیە لە پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندنی نەوەکاندا، ئینجا ڕۆڵی قوتابخانە و زانکۆ و ناوەند و ئۆرگانەکانی دیکەی کۆمەڵگە دێت.

بۆیە ئەگەر خێزان، بەتایبەتی دایک و باوک، پلانگەلێکی ڕێکوپێك و سیستماتیك و تۆکمەی زانستی و فێرکاری و پەروەردەییان هەبێت بۆ پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندنی منداڵ و نەوەکانیان، هەروەها پلانەکانیان بۆ هێنانەدی ئامانجگەلێکی پیرۆز و مرۆڤدۆستانە و ژیاندۆستانە بێت و هاوشانی ناوەندەکانی دیکەی تێگەیاندن و پێگەیاندن، میکانیزمەکانی پێویست بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجگەلانە بگرێتەبەر، مسۆگەر دەتوانێ نەوەیەکی دانا و زانا و بەتوانا و وشیار و بێدار و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پشتبەخۆبەستوو و سەرکەوتوو پێشکەش بە کۆمەڵگە بکات، کە لە ئایندەدا بتوانێ ببێتە کەسێکی لێهاتوو و سوودبەخش بۆ خۆی و کۆمەڵگە، هەروەها پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێ و لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێ و وەك سوارچاکێکی بلیمەت، لە گۆڕەپانی داهێنان و ئەفراندندا ئەسپی خۆی تاو بدات و لە گشت کایەکانی ژیاندا شوێندەستی دیار بێت.

بەڵام ئەگەر پایە و کۆڵەگەکانی دامەزراوەی خێزان، سست و لەق بوون و دایکان و باوکان ئامانج و پلانیان نەبوو بۆ فێرکردن و

پێگەیاندنی نەوەکانیان، هەروەها ئاشنانەبوون بە بنەما زانستییەکانی پەروەردە و فێرکردن و قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ، ئەوا بێگومان دیوارەکانی ئەو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەش سست و لەرزۆك دەبن و زوو یان درەنگ، ئەگەری ئەوە هەیە بڕووخێت و لەناو بچێت و خێزان و کۆمەڵگە مایەپووچ ببن!!

بۆیە هەر دایك و باوکێك، لە هزری ئەوە دابێت، بەشێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە و پەروەردەیانە منداڵەکانی خۆی پەروەردە بکات و پێبگەیەنێت، دەبێ لە خۆیەوە دەستپێبکات و زەمینەیەکی لەبار و گونجاو لەناو خێزاندا فەراهەم بکات، تاکو منداڵ بەشێوەیەکی مرۆڤدۆستانە و ژیاندۆستانە و تەندروست لە ناو ئەو ژینگەیەدا پەروەردە ببێت و بتوانێت خزمەتێکی گەورە بەخۆی و کۆمەڵگە و جیهانی مرۆڤایەتی بکات.

بەڕاستی کەس نییە لە ژیاندا هەڵە نەکات، هەروەك وتراوە:(ئەو کەسەی هیچ هەڵەیەك نەکات، هیچ شتێکی لە ژیاندا تاقی نەکردۆتەوە)، بە واتایەکی دیکە تەنیا ئەو کەسە هەڵە ناکات کە کار نەکات! بۆیە هەڵەکردن کارێکی ئاساییە! تا ئەو کاتەی کە مرۆڤ پەی بە هەڵەکانی خۆی نەبردبێت، بەڵام هەرکاتێ پەی بە هەڵەکانی خۆی برد، یاخود لەلایەن کەسان و نۆرگانەکانی دیکەوە ئاگادار کرایەوە، کە بەهەڵەداچووە، لەوسا بەدواوە، بۆ مرۆڤ نییە لەسەر هەڵەی خۆی ڕژد و بەردەوام بێت، یان هەڵە بە هەڵە چارەسەر بکات.

بەڵکو دەبێت بەشێوەیەکی زانستییانە هەڵەکانی خۆی ڕاستکاتەوە و هەوڵ بدات جارێکی دیکە لە ژیاندا دووبارە و چەندبارەی نەکاتەوە.

لەم سۆنگەیەوە ویستم تیشکێك بخەمە سەر ئەو هەڵە و چەوتییانە، کە هەندێ لە دایکان و باوکان لێرە و لەوێ، لە ژیانی ڕۆژانەیاندا دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، چونکە هەڵە وەك ئاگر وایە! ڕەنگە بە دەنکە شەخارتەیەك دەستپێبکات! بەڵام ئەگەر نەکوژرێتەوە، دارستانێك بە تەڕ و وشکییەوە بسووتێنێ!!

بۆیە دەستنیشانکردنی ئەو هەڵە و چەوتییانە، وا دەکات کە بەدوای چارەسەرەکاندا بگەڕێین و زامەکان سارێژ بکەین و برینەکان تیمار بکەین و کێشە و قەیرانەکان چارەسەر بکەین.

هەر وەك دەزانن، لە بەرگی یەکەمی ئەم پەرتووکەدا، تیشکم خستبووە سەر کۆمەڵە هەڵەیەك، کە دایکان و باوکان ڕۆژانە کەم تا زۆر، دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، لەم بەرگەشدا، چەند هەڵەیەکی دیکە، لەو هەڵە باوانە دەخەمە بەرباس، کە لەلایەن باوانەوە ئەنجام دەدرێن.

دڵنیام ئەگەر دایکان و باوکانی خۆشەویست، بەرگی یەکەم و دووەمی ئەم پەرتووکە بەوردی بخوێننەوە و سوود لەو ڕێنمایی و ڕاسپاردە و ئامۆژگارییانە وەربگرن، کە بۆ هەر هەڵەیەك خراونەتە ڕوو، ئەوا دەتوانن زۆرێك لەو کێشە و ئارێشانە چارەسەر بکەن کە ڕۆژانە لێرە و لەوێ ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

هەروەها داوا لە خوێنەرانی ڕێزدار دەکەم کە ڕا و سەرنج و ڕەخنە و پێشنیازەکانی خۆیان بۆ بەندە بنێرن، تاکو لە چاپ و بەرگەکانی ئایندەدا سوودی لێ وەربگرم.

لە کۆتاییدا، هیوادارم ئەم پەرتووکە جێگەی ڕەزامەندی خوێنەران و دایکان و باوکانی خۆشەویست بێت و ببێتە هەوێنی خۆشەویستی لە نێوان دایکان و باوکان و منداڵەکانیان و، کەلێنێکی بچووکیش لە پەرتووکخانەی کوردی پڕبکاتەوە.


محەمەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

بەحرکە ٢٠١٦

تەلەفۆن/ ٠٧٥٠٤٤٨٥٨٩١

(muhammad.s.pendroi@gmail.com)

## ستەمکردن لە منداڵ

یەکێك لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بەمنداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە ستەمکردن و چەوساندنەوەی منداڵ، جا چ ستەمەکە ماددی بێت وەك بێبەشکردنی منداڵ لە مافی میرات و پێداویستییەکانی ژیان، وەك جلوبەرگی نوێ و کەلوپەلەکانی قوتابخانە و یاری، یان ستەمی مەعنەوەی بێت وەك چەوساندنەوە و بێبەشکردن لە مافی ئازادی و دادپەروەری و خۆشگوزەرانی و قسەکردن و خوێندن و فێربوون و....تاد.

ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- بەهرەمەندبوون لە دڵڕەق و توندوتیژی و شەڕەنگێزی.
- لاوازی هەستی مرۆڤدۆستی و ژیاندۆستی.
- هەبوونی گرێی دەروونی.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری.
- بێ ئەزموونی و ناوشیاری.
- ئاشنانەبوون بە مافەکانی منداڵ.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- دوورکەوتنەوە لە بەها ئایینی و مرۆڤییەکان.
- نەبوونی چاودێری و لێپرسینەوە.
- کارانەبوونی یاسا، بۆ بەسزاگەیاندنی ستەمکاران!
- بۆ خۆ بەتاڵکردنەوە و تۆڵەکردنەوە.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك یان باوك، یاخود هەردووكیان واز لە ستەم و چەوساندنەوەی منداڵەكانیان نەهێنن و لاپەڕەیەكی تازە هەڵنەدەنەوە، زیانێكی زۆر بە منداڵەكانیان و خودی خۆیان و كۆمەڵگەش دەگەیەنن، كە گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵ تا مردن، تامی ستەم و ستەمكاری دایك و باوكی دەچێژێت.
- منداڵ هەست بە خۆبەكەمزانین دەكات.
- منداڵ زۆرێك لە مافەكانی خۆی لە دەست دەدات.
- منداڵ بە شێوەیەكی تەندروست گەشە ناكات، بەتایبەتی لەڕووی سۆزداری و دەروونی و زانستی و هزرییەوە.
- منداڵ فێرە ڕق و كینە دەبێت و هەستی تۆڵەسەندنەوە بەسەریدا زاڵ دەبێت.
- ـوان و كەتن لە ناو كۆمەڵگەدا زیاد دەبێت.
- منداڵ ڕقی لە دایك و باوك و كەسانی دیكە دەبێتەوە.
- منداڵ دووحا،ی، نیگەرانی و ڕەشبینی و خەمۆكی دەبێت.
- مـ..ـں ـەنا ـۆ كاری ناڕاست و هەڵە دەبات.
- منداڵ دەبێتە ـەسێكی گۆشەگیر و دوورە پەرێز.

**چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە**

پێش هەموو کەسێك، دەبێ دایك و باوك دەست لە ستەمکردن هەڵگرن و ستەم لە منداڵەکانیان نەکەن و نەیانچەوسێننەوە، بۆ ئەوەی شکۆی منداڵەکانیان پارێزراو بێت و بەشێوەیەکی تەندروست گەشە بکەن و نەوەیەکی زانا و دانا و بەتوانا و وشیار و بێدار و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پێشکەوتوو و سەرکەوتوو پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن و چاویان پێ ڕۆشن بێت و سەریان پێ بەرز بێت.

جا بۆ ئەوەی ئەم ئامانجەیان بێتە دی، پێویستە دایکان و باوکان ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- نابێ توخنی ستەم و زۆرداری بکەون.
- دەبێ ئاشنا بن بە مافەکانی منداڵ، چونکە زۆرجار بەهۆی نەزانینەوە مافەکانیان پێشێل دەکرێت و پشتگوێ دەخرێت.
- دەبێ ئاستێکی بەرزی زانستی و ڕۆشنبیرییان هەبێت، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی تەندروست و پەروەردەیانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ ڕێز لە کەسایەتی و شکۆی منداڵەکانیان بگرن.
- پێش هەموو شتێك، دەبێ وەك مرۆڤ سەیری منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ دایك و باوکەکان تا ئەوپەڕی توانا دادگەر و دادپەروەر بن و جیاکاری لە نێوان منداڵەکانیان نەکەن.
- دەبێ سۆز و خۆشەویستی خۆیان بە منداڵەکانیان ببەخشن.
- دەبێ ئاشنا بن بە بنەما پەروەردەیی و زانستییەکان.

- دەبێ لەکاتی سەرهەڵدانی هەر جۆرە تەنگژە و کێشە و بگرە و بەردەیەکی خێزانیدا، خۆیان بەدوور بگرن لە توندوتیژی و قسەی زبر و شەڕەنگێزی.
- دەبێ بە زمانی گوڵ قسە لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ لە ئەرك و کارەکانیاندا ئارام و دانبەخۆداگر بن، چونکە پەروەردە و فێرکردنی منداڵ ئەرکێکی سەخت و دژوارە.
- دەبێ دایك و باوك خۆیان بەدوور بگرن لە هەستی تۆڵەسەندنەوە.
- نابێ کێشەی خێزانی ببێتە هۆی ستەمکردن لە منداڵان و کەسانی دیکە.
- دەبێ دایك و باوك مافە ماددی و مەعنەوییەکانی منداڵەکانیان دابین بکە و ئەو بەرپرسیارەتییە لە ئەستۆ بگرن.
- دەبێ کێشەکانیان بە پرس و ڕاوێژ چارەسەر بکەن.
- دەبێ لە کاتی پێویستدا پرس و ڕاوێژ بە کەسانی پسپۆر و شارەزا بکەن.

## نەبوونی متمانە لە نێوان دایک و باوک و منداڵ

ڕاستگۆیی و متمانە بەیەکترکردن و پشت بەیەکتری بەستن بەردی بناغەی خێزانێکی تۆکمە و بەختەوەرە، بەڵام مخابن! لەم ڕۆژگارە جەنجاڵەدا، خەریکە ئەم پایە مەحکەمە لەق دەبێت!

یەکێك لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بەمنداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە نەبوونی پردی متمانە لە نێوان ئەوان و منداڵەکانیان. واتە جۆرە بێ متمانەیی و بەدگومانییەك لە نێوانیاندا هەیە و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا ڕەنگی داوەتەوە و ڕەگی داکوتاوە، تاوانی نەبوونی ئەو متمانەیەش، زیاتر لە ئەستۆی دایك و باوکەکانە، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

- دایکان و باوکان لە گوفتار و ڕەفتار و کرداریاندا ڕاستگۆنین و زۆرجار بەمەبەستی بەلاڕێدابردنی منداڵەکانیان، پەنا بۆ درۆ و چەواشەکاری دەبەن!
- نەبوونی ڤاڵابێژی (صراحة).
- بەدگومانی و دڵپیسی دایك و باوك بەرامبەر بە منداڵەکانیان.
- دایك و باوکەکان زیاد لە پێویست دەست لە کاروباری منداڵەکانیان وەردەدەن.
- خەڵك دەست لە کاروباری ژیانی ئەو جۆرە خێزانانە وەردەدات.
- ڕاستنەکردنەوەی هەڵەکان و درێژەدان بە هەڵە و کەموکوڕییەکان.
- چارەسەرنەکردنی کێشەکان بە دان و ستاندن و گفتوگۆ.
- نەبوونی لێبوردەیی و بەخشندەیی.

- خۆشباوەری و کەمبینی.
- پەڵەکردن لە بڕیاردان.
- کەڵەکەبوونی کێشەکان و مانەوەیان بەبێ چارەسەرکردن.
- نەبوونی ژینگەیەکی تەندروست بۆ پێکەوەژیانی ئەندامانی خێزان.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- هەژاری و دەستکورتی.
- هەڵبژاردنی هاوڕێی خراپ لەلایەن منداڵەوە.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- نەڕەواندنەوەی گومانەکان.
- چارەسەرکردنی هەڵە بە هەڵە.

ئەڵبەتە ئەگەر پردی متمانە لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکان نەبێت،ڕووبەڕووی زۆر کێشە و گرفت دەبنەوە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- بەدگومانی و دڵپیسی، شوێنی متمانە و بڕوا بەیەکترکردن دەگرێتەوە.
- دایك و باوك و منداڵەکانیان ناتوانن پشت بە یەکتری ببەستن.
- لە کار و ئەرك و بەرپرسیارەتییەکەیاندا سەرکەوتوو نابن.
- خەڵك زیاتر دەست لە کاروباریان وەردەدات.
- خۆشەویستی و سۆز و ڤیان لەناو خێزاندا نامێنێ.
- دایك و باوك و منداڵەکانیان لێکدەترازێن و ناتوانن پێکەوە بسازێن.
- دایك و باوك و منداڵەکانیان ناتوانی پێکەوە هاوکاربن و ببنە پشت و پەنای یەکتری.

- نەبوونی متمانە دەبێتە سەرچاوە بۆ سەرهەڵدانی زۆر کێشەی دیکەی خێزانی و کۆمەڵایەتی.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ دروستکردنی پردێکی پتەوی متمانە لە نێوان دایکان و باوکان و منداڵەکانیان، پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگیرێن:

- فەراهەمکردنی کەش و هەوایەکی گونجاو بۆ گشت ئەندامەکانی خێزان، بۆ ئەوەی وەك هەنگ پێکەوە بەشداربن لە دروستکردنی هەنگوینی شیرینی ڤیان و ژیان!
- پێویستە ڕاستگۆیی ببێتە بەردی بناغەی پێکەوە ژیانی ئەندامانی خێزان.
- خۆدوورخستنەوە لە گومانی خراپ و هەڵبەستنی تۆمەتی بێبنەما.
- چارەسەرکردنی کێشەکان بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە و لە ڕێگەی گفتوگۆ و دان و ستاندنەوە.
- پێویستە خۆشەویستی و لێبوردەیی و سینەفراوانی ببێتە بەردی بناغەی پێکەوە ژیان و هەوێنی پێکەوە مانەوە.
- دوورخستنەوەی منداڵ لە هاوڕێ و ڕەفیقی خراپ.
- ڕێزگرتن لە بۆچوونی یەکتری، تەنانەت ئەگەر ڕا و بۆچوونەکانیشیان جیاواز بن.
- پەڵەنەکردن لە بڕیاردان، تا ڕاستییەکان ساغنەبنەوە.
- دوورکەوتنەوە لە هەڵە، بەتایبەتی هەڵەی ئەنقەست.

- خۆپاراستن لە پەرتەوازەیی و گۆشەگیری و دوورەپەرێزی.
- خۆدوورخستنەوە لە خۆسەپاندن و تاکڕەوی.
- چارەسەرکردنی کێشەکان و نەهێشتنەوەیان بە هەڵپەسێردراوی.
- ڕەواندنـــەوەی گومـــان و تارمایـــەکان لـــە ڕێگـــەی خســـتنە ڕووی ڕاستییەکانەوە.
- خۆدوورخستنەوەی لە کەرب و کین و تۆڵەسەندنەوە.

## پرس و ڕاوێژ نەکردن بە منداڵ

پرس و ڕاوێژ کۆڵەگەیەکی هەرە بەهێزی هەموو ماڵ و خێزان و کۆمەڵگەیەکە، تەنانەت ڕایەدار و دەوڵەتمەدارانیش بەبێ پرس و ڕاوێژ کارەکانی خۆیان ڕایی ناکەن و نامەشێنن!

بۆیە هەر ماڵ و خێزانێك پرس و ڕاوێژی تێدا نەبێت و کار بەو پرەسیپە نەکرێت، ئەو خێزانە ڕووبەڕووی کێشەی زۆر ئاڵۆز و مەزن دەبێتەوە و ناتوانێ بەرامبەر کێشەکان خۆڕاگر بێت و زوو یان درەنگ کاریگەری نەرێنیی لەسەر سیستمی ژیانی ئەو خێزانە جێدەهێڵێت و دووریش نییە لەبەریەك هەڵبوەشێتەوە، یان لێکبترازێت!!

مخابن! هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بەمنداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە پرس و ڕاوێژ نەکردن بە منداڵەکانیان، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە گەورە دەبن و دەزانن چاکە چییە و خراپە چییە و ڕەش چییە و سپی چییە و تاڵ چییە و شیرین چییە.

ئەمەش بۆ چەند ئەگەرێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەم جۆرە دایك و باوکانە خۆیان لە منداڵەکانیان بە باڵاتر وگەورەتر و زاناتر و شارەزاتر دەزانن و پێیان وایە منداڵان مافی ئەوەیان نییە پرس و ڕاوێژیان پێ بکرێت.
- کەمبینی و تەسکبینی و کورتبینی دایك و باوك.
- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- نادیدەگرتنی بەها مرۆڤییەکان.

- هەبوونی گرێی دەروونی.
- هەبوونی کێشەی خێزانی.
- نادیدەگرتنی فەزلی پرس و ڕاوێژکردن.
- نەبوونی پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و پتەو لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان.
- نەبوونی ژینگەیەکی تەندروست و لەبار بۆ پێکەوە ژیان.
- نەبوونی سۆز و خۆشەویستی لەناو خێزاندا.
- زاڵبوونی هەستی خۆسەپاندا لەناو خێزاندا.
- ڕێزنەگرتن لە بۆچوونی جیاواز.

ئەڵبەتە ئەگەر پرس و ڕاوێژ بە منداڵان نەکرێت، بەتایبەتی کاتێ کە گەورە دەبن، هەروەها لەسەر ئەو بابەتانەش کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە چارەنووسی ئەوانەوە هەیە، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشە و، زیان بە بەرژەوەندی دایك و باوك و منداڵ دەگەیەنێت،گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ هەست دەکات پەراوێز و فەرمۆشکراوە.
- منداڵ هەست بە دڵتەنگی و نیگەرانی دەکات.
- هەستی خۆبەکەمزانین لای منداڵ دروست دەبێت.
- منداڵ بڕوا و متمانەی بەخۆی و دایك و باوکی نامێنێت.
- پرس نەکردن بە منداڵ، وا دەکات کە بڕیارەکانی خێزان بە کۆدەنگی نەدرێن و لایەك ڕای خۆی بەسەر لایەکی دیکەدا بسەپێنێت.
- زەمینەی ڕقنەستووری و ڕق و کینە لەناو خێزاندا زۆر دەبێت.

- خێزان ڕووبەڕووی کێشە و تەنگژە دەبێتەوە.
- خۆشەویستی و سۆز و ڤیان لە نێوان ئەندامانی خێزاندا بەرەو کاڵبوونەوە دەچێت.
- منداڵەکان لەڕووی زانستی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و هزرییەوە بەشێوەیەکی تەندروست گەشە ناکەن.
- منداڵ لە زۆر ماف بێبەش دەبێت و ستەمی لێدەکرێت، بەتایبەتی لەو بوارانەدا کە پەیوەندی بە خودی خۆیەوە هەیە.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

دەبێ دایکان و باوکان درك بە گرنگی پرس و ڕاوێژ بکەن، چ لەگەڵ خۆیان، چ لەگەڵ ئەندامانی دیکەی خێزان، بەتایبەتی منداڵەکانیان، چونکە ئاستی سەرکەوتن و سەرنەکەوتنیان لە ژیاندا تا ئەندازەیەکی زۆر پەیوەستە بەو پرەنسیپەوە، جا بۆ ئەوەی دایکان و باوکان بەشێوەیەکی تەندروست بڕیار بدەن و هەمووان لە ئاست جێبەجێکردنی ئەو بڕیارنەدا خۆیان بەبەرپرسیار بزانن، هەروەها بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان لەوپەڕی تۆکمەیی و پتەوی دابێت، پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- هەموو کارێك، بەتایبەتی ئەو کارانەی کە پەیوەندی بە مافەکانی منداڵانەوە هەیە، بە پرس و ڕاوێژ لەگەڵ منداڵەکانیان یەکلایی بکەنەوە، واتە پرس و ڕاوێژ ببێتە بەردی بناغەی کارکردن و پێکەوەژیانی ئەندامانی خێزان.
- خۆیان لە بڕیاری تاکلایەنە و تاکڕەوانە بپارێزن و خۆسەپێنەر نەبن.

- پەلە نەکەن لە بڕیاردان.
- ئاشنا بن بە مافەکانی منداڵ.
- بەشێك لە بەرپرسیارەتی بە منداڵەکانیان ببەخشن.
- بە چاوێکی کەم سەیری منداڵەکانیان نەکەن.
- ڕێز لە ڕاجیایی بگرن و دڵ و دەروون و سینە فراون بن.
- ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- میهرەبان و دلسۆز بن بۆ منداڵەکانیان و خۆیان لە ستەم و زۆرداری بپارێزن.
- پێویستە هەر لە سەرەتاوە منداڵان لەسەر پرەنسیپی پرس و ڕاوێژ ڕابێنن، بۆ ئەوەی کە گەورەبوون، بە شێوەیەکی کردەیی سەرەدەری لەگەڵ ئەو چەمکەدا بکەن و خۆیان لە هەموو جۆرە بڕیارێکی تاکرەوانە و خۆسەپێنەرانە بپارێزن.
- پرس و ڕاوێژ، هاوسەنگی و خۆشەویستی نێوان ئەندامانی خێزان بەگشتی و، دایکان و باوکان و منداڵەکانیان بەتایبەتی دەپارێزێت.

## شەڕ و دەمەقاڵێی دایک و باوک لە پێش چاوی منداڵ

شەڕکردنی دایك و باوك، بەتایبەتی لە پێش چاوی منداڵ، هێڵی سوورە، چونکە کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر هەست و سۆز و دەروون وگەشەی منداڵ جێدێڵێ.

مخابن هەندێ لە دایکان و باوکان بەبێ لەبەرچاوگرتن و پاراستنی بەرژەوەندی منداڵ، لەبری ئەوەی بە ڕێگەی دان و ستاندن و گفتوگۆ، کێشەکانی نێوانیان چارەسەر و یەکلایی بکەنەوە، لە پێش چاوی منداڵەکانیان، پەنا بۆ شەڕ و دەمەقاڵێ و یەکتر تۆمەتبارکردن و تۆمەت بۆ یەکترهەڵبەستن و یەکتر ناشیرینکردن دەبەن.

ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان ماف و ئەرکەکان.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- کەلەکەبوونی کێشەکان و نەدۆزینەوەی چارەسەر بۆیان.
- ڕانەهاتن لەسەر گفتوگۆکردن لەکاتی یەکلایی کردنەوەی کێشەکاندا.
- زاڵبوونی هەستی پیاوسالاری و نێرسالاری و گەورەسالاری!
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- نەپاراستنی بەرژەوەندییەکانی منداڵ.
- نەخوێندنەوەی منداڵ.
- ناوشیاری و بێئاگایی دایك و باوك.
- نەبوونی پرس و ڕاوێژ لە ناو خێزاندا.
- درك نەکردن بە بەرپرسیارەتی.

- هەبوونی ڕق و کینە و ڕقنەستووری و هەستی تۆڵەسەندنەوە لە ناخی دایک و باوکدا.
- دەستوەردانی کەسانی دیکە لە کاروباری خێزان.
- خۆخاڵیکردنەوەی دەروونی.
- نەبوونی سۆز و خۆشەویستی و یەکترقبووڵکردن لەناو ئەندامانی خێزاندا، بەتایبەتی دایک و باوک.

بێگومان ئەگەر شەڕ و دەمەقاڵێی دایک و باوک بەردەوام بێت، بەتایبەتی لەناو خێزان و بەبەرچاوی منداڵەکانیانەوە، زیانێکی زۆر بە خودی دایکان و باوکان و منداڵەکانیان دەگەیەنێت، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- هەمیشە خێزان بەدەست کێشە و قەیرانەوە دەناڵێنێ.
- ڕێز و حورمەت و سۆز و خۆشەویستی لە نێوان ئەندامانی خێزان نامێنێ.
- دایک و باوکەکان هەیبەتی خۆیان لای منداڵەکانیان لە دەست دەدەن.
- شەڕ و دەمەقاڵێ، جێگەی دان و ستاندن و گفتوگۆ دەگرێتەوە و لۆژیکی هێز بەسەر هێزی لۆژیکدا زاڵ دەبێت.
- منداڵ، لە دایک و باوکییەوە فێرە شەڕ و دەمەقاڵێ دەبێت و لە ئایندەدا لاسایی ئەوان دەکاتەوە.
- کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر گەشە هزری و دەروونی و زانستی و کۆمەڵایەتییەکانی منداڵ جێدێڵێ.
- ڕۆژ دوای ڕۆژ کێشەکان زیاد دەبن و چارەسەرەکانیش ئەستەم دەبن.

- زەمینە خۆش دەبێت، بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر دەست لەکاروباری خێزان وەربدات.
- حەزی تۆڵەسەندنەوە زاڵ دەبێ بەسەر حەزی لێبووردن و یەکترقەبووڵ کردن و یەکتر خوێندنەوەدا.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك لە کەش و هەوایەکی ئارام و تەندروستدا منداڵەکانیان پەروەردە بکەن و بتوانن نەوەیەکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- خۆیان لە گشت جۆرە توندوتیژییەك بەدوور بگرن، لەوانەش شەڕ و دەمەقاڵێ، بەتایبەتی لە پێش چاوی منداڵەکانیان.
- کێشە و ئارێشەکانیان بە ڕێگەی دان و ستاندن و گفتوگۆ چارەسەر بکەن.
- هەمیشە پەنا بۆ هێزی لۆژیك ببەن، نەك لۆژیکی هێز.
- هەمیشە مەبدەئی پرس و ڕاوێژکردن پەیڕەو بکەن.
- خۆیان بەدووربگرن لە بەدگومانی و دڵپیسی و ناوزڕاندن.
- بەشێك بن لە چارەسەر، بەشێك نەبن لە کێشە.
- خۆیان لە قسەی هەستبرندارکەر و زبر بپارێزن.
- ڕێز لە یەکتری بگرن.
- ڕاجیایی بە شتێکی ئاسایی وەربگرن.
- عەقڵیان زاڵ بێت بەسەر هەستیاندا.

- لە کاتی تووڕەیی و تەنگژەکاندا ئارام و دانبەخۆداگر بن.
- زیاتر کار لەسەر خاڵە هاوبەشەکانیان بکەن، نەك جیاوازەکان.
- دایك و باوك بە یەکەم مامۆستا دادەنرێن بۆ منداڵەکانیان، بۆیە دەبێ لەو ئەرکە قورسەدا سەرکەوتوو بن و نموونەی دڵسۆزی و وەفاداری و دەمپاکی و نیازپاکی و دەستپاکی و ناخپاکی بن.

## هەڵبەستنی تۆمەتی بێبنەما بۆ منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەیگرنەبەر، هەڵبەستنی تۆمەتی بێبنەمایە بۆ منداڵ، واتە هەندێ کار و سیفەت دەدەنە پاڵ منداڵ، کە منداڵ لەو کار و سیفەتانە دوورە و تێوە نەگلاوە، بۆ نموونە پێی دەڵێن: درۆزن، فێڵباز، ئەدەب سست، تەمبەڵ، چاوشۆڕ و کلاوچی و قومارچی و و کلاوچی و...تاد. زیاتر ئەمەش بۆ چەند هۆکارێکی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- پەی نەبردنی دایك و باوکەکان بە زیانەکانی ئەم دانەپاڵە و هەست نەکردن بە مەترسییەکانی ئەم کارە هەڵەیە.
- هەڵەشەیی و نەبوونی وردبینی لە کار و کردار و ڕەفتارەکانیاندا.
- تفەنگ بەتاریکییەوەنان.
- خۆسەپاندن و خۆهەڵکێشان.
- چەوساندنەوە و سەپاندنی هەژموونی خۆیان.
- نەزانین و بێئاگایی و ناوشیاری دایك و باوك.
- لاوازی ئاستی زانستی و خوێندەواری.
- پابەندنەبوون بە بنەما ئایینی و ڕەوشتییەکان.
- خەمساردی و بێباکی و کەمتەرخەمی دایك و باوك.
- نەبوونی ژینگەیەکی تەندروست.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- زوو بڕیاردان و وردنەبوونەوە لە کار و هەنگاوەکانیاندا.

ئەڵبەتە، ئەگەر دایك و باوك ئەم هەڵەیە ڕاست نەکەنەوە و خۆیان لە هەڵبەستنی تۆمەتی بێبنەما نەپارێزن، هەم خۆیان، هەم منداڵەکانیان و کۆمەڵگەش ڕووبەڕووی کێشە دەکەنەوە، گرنگترین ئەو کێشانەش ئەمانەن:

- منداڵ بە شێوەیەکی ناتەندروست پەروەردە دەبێت.
- منداڵ بڕوا و متمانەی بە خۆی و دایك و باوکی نامێنێ.
- دووچاری هەڵە و کاردانەوەی خراپ دەبێت.
- بۆ خۆدەربازکردن لەو تۆمەتانە پەنا بۆ درۆ و کاری نابەجێ دەبات.
- هەستی خۆبەکەمزانین بەسەر ناخ و دەروونیدا زاڵ دەبێت.
- پەیوەندی نێوان دایك و باوك منداڵ لاواز دەبێت.
- ژینگەی خۆجێیی و دەوروبەر و کۆمەڵگە بە گشتی بەچاوێکی کەم سەیری منداڵ دەکات.
- منداڵ دووچاری گۆشەگیری دەبێت.
- منداڵ پەنا بۆ هاوڕێ و دۆستی خراپ دەبات.
- خێزان لە سۆز و خۆشەویستی بەتاڵدەبێتەوە.
- منداڵ ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت و لەکارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك ئەم هەڵەیە دووبارە و چەندبارەی نەکەنەوە و بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگەیەکی ڕاست و دروست و پردێکی پتەوی پەیوەندی لە نێوان خۆیان و منداڵەکانیان دروست بکەن، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- نابێ پەنا بۆ تۆمەتی هەڵبەستراو و بێبنەما ببەن.
- دەبێ هەمیشە هەوری بەدگومانی و دڵپیسی بڕەوێننەوە و بە ڕاشکاوانە قسە لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- نابێ پێش ڕووداوەکان بکەون و زوو بڕیار بدەن.
- دەبێ لەگەڵ منداڵەکانیان دۆست و هاوڕێ بن، بۆ ئەوەی هیچ شتێکیان لێ نەشارنەوە.
- دەبێ کارەکانی خۆیان بە پرس و ڕاوێژ ئەنجام بدەن.
- دەبێ لێبوردەبن و لەکاتی پێویست چاوپۆشی لە هەندێ هەڵەی منداڵەکانیان بکەن، بەتایبەتی ئەگەر هەڵەکە بچووك بێت و بە ئەنقەست نەبووبێت و دەرهەق بە ئەوان بووبێت، تاکو ببێتە هەوێنی سۆز و خۆشەویستی.

- دەبێ دایك و باوك دووربین و وردبین و واقعبین بن و خۆیان لە کورتبینی بەدووربگرن.
- دەبێ پەیوەندییەکانیان لەگەڵ منداڵەکانیان لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی و میهرەبانی بێت و دوور بێت لە توندوتیژی و شەڕەنگێزی و شکاندنەوە و تەرقیکردنەوە و...تاد.
- تا بەبەڵگە ساغنەبێتەوە، نابێ هیچ تۆمەتێك بدەنە پاڵ هیچ کەسێك، بەتایبەتی منداڵەکانیان.
- دەبێ سادە و خۆشباوەڕ نەبن و تڤەنگ بە تاریکییەوە نەنێن و ئارامگر و دانبەخۆداگر بن.

## ئاشنانەکردنی منداڵ بە ئادابەکانی ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە ئاشنانەکردنی منداڵ بە ئادابەکانی ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی، وەك پێشوازی و بەدەرەقەکردنی میوانەکان، شوشتنی ددانەکان، ڕێزگرتن لە گەورە، ڕێزگرتن لە مامۆستا، شێوازی نان خواردن، شێوازی قسەکردن و گفتوگۆکردن و نووستن و زوو لەخەوهەستان و...تاد.

ئەڵبەتە ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- بەهەندوەرنەگرتنی ئادابە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان.
- ئاشنانەبوونی دایك و باوك بەو ئادابانە.
- خەمساردی و کەمتەرخەمی دایك و باوك.
- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- زۆری ژمارەی منداڵ.
- فرەکاری و نەبوونی کاتی پێویست لەبەردەستی دایك و باوك، بەهۆی سەرقاڵبوونیانەوە.
- هەژاری و دەستکورتی و نەبوونی.

بێگومان ئاشنانەبوونی منداڵ بە ئادابە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان، لە گشت ڕوویەکەوە زیان بە گەشەی منداڵ دەگەیەنێت، بەتایبەتی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، کە لە چەند خاڵێکدا چڕدەکەینەوە:

- منداڵ لەو ئادابە خێزانی و کۆمەڵایەتییانە بێبەش دەبێت و ناتوانێ وەك پێویست خۆی لەگەڵ ژیوار و واقع بگونجێنێ.
- منداڵ وەك کەسێکی کاڵ و ناپێگەیشتوو گەورە دەبێت.

- منداڵ دووچاری هەڵەی زۆر دەبێت.
- منداڵ ڕووبەڕووی کۆمەڵێك کێشە دەبێتەوە، بەتایبەتی لە سەرەدەریکردنەکانیدا.
- کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر گەشەی منداڵ جێدێڵێ، بەتایبەتی لە ڕووی تەندروستی و کۆمەڵایەتییەوە.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ هەر لەسەرەتاوە لەسەر ئادابە پێویستەکانی خێزانی و کۆمەڵایەتی ڕابهێنرێت و ئاشنا بکرێت، ئەرکی دایکان و باوکانە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- ئادابە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان بە جددی بگرن.
- منداڵ ئاشنا بکەن بە ئادابە گرنگەکان، بەپێی پێویست و بەپێی تەمەن.
- پێویستە ئەو ئادابانە ڕەنگدانەوەیان هەبێت لەسەر کار و کردارەکانی دایکان و باوکان، بۆ نموونە کاتێ منداڵ فێری ئادابانی ددان شوشتن دەبێت، کە بەچاوی خۆی ببینێت کە ڕۆژانە دایك و باوکی گرنگی بەددانەکانیان دەدەن و دەشۆن، یان کاتێ منداڵ فێرە ڕێزگرتن دەبێت لە میوان، کە دایك و باوکەکانی بە شێوەیەکی شایستە و جوان ڕێز لە میوان بگرن و بە جوانی بەترەقەیان بکەن و ...تاد.

واتە دەبێ دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان ئاوێنە بن ومنداڵەکانیان خۆیان تێدا ببیننەوە.

## دابین نەکردنی پێداویستییە ماددیەکانی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە دابین نەکردنی پێداویستییە ماددیەکانی منداڵ، وەك جلوبەرگ، پێداویستییەکانی خوێندن، چارەسەرکردنی نەخۆشی و...تاد.

ئەمەش بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەژاری و دەستکورتی خێزان و دایك و باوك.
- هەستنەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- خەمساردی و کەمتەرخەمی.
- سەرقاڵی و فرەکاری.
- زۆری ژمارەی منداڵ.
- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- لاوازی هەستی مرۆڤدۆستی.

ئەڵبەتە ئەگەر دایکان و باوکان، پێداویستییە ماددییەکانی منداڵەکانیان دابین نەکەن، دەبێتە هۆی بێبەشبوونی منداڵ لە زۆر شت و کاریگەری نەرێنی لەسەر گەشی منداڵ جێدێڵێ و زیانێکی زۆری پێدەگات، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- هەست بە بەشخۆراوی دەکات.
- هەست بە خۆبەکەمزانین دەکات.
- دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی و دایك و باوکی نامێنێت.

- کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر گەشی منداڵ جێدێڵێ، بەتایبەتی لەڕووی گەشەی جەستەیی و هزری و زانستی و کۆمەڵایەتییەوە.
- لە خوێندندا سەرکەوتوو نابێت.
- دووچاری دزی و لاساری دەبێت.
- مەودایەکی زۆر دەکەوێتە نێوان خۆی و دایك و باوکی.
- ڕقی لە دایك و باوکی دەبێتەوە.
- بیر لە تۆڵەسەندنەوە دەکاتەوە.
- لە ژیانیدا سەرکەوتوو نابێت.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ بە شێوەیەکی ئاسایی گەشە بکات و گشت قۆناغەکانی ژیانی بەسەرکەوتوویی ببڕێت، پێویستە دایکان و باوکان، گشت پێداویستییەکانی ژیان، بەتایبەتی پێداویستییە ماددییەکان بۆ منداڵەکانیان فەراهەم بکەن، وەك خۆراك و پۆشاك وپێداویستییەکانی خوێندن و...تاد. تاکو زۆری و ستەم لە منداڵەکانیان نەکرێت و چاویان لە دەستی ئەو و ئەو نەبێت و دووچاری لاساری نەبن و پەنا بۆ دزینی ماڵی خەڵك نەبەن.

هەروەها بەخێوکردنی منداڵ، ئەرکێکی سەرەکی دایکان و باوکانە و بەرپرسیارەتییەکە لە ئەستۆی ئەوان دایە و پێویستە لە ئاست ئەو بەرپرسیارەتە دابن و هەرچی هەیە و پێویستە، بە منداڵەکانیان ببەخشن، بۆ ئەوەی بتوانن نەوەیەکی زانا و دانا و بەتوانا پێبگەیەنن و تێبگەیەنن و پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن.

## فێڵ لە منداڵ کردن و شاردنەوەی ڕاستییەکان

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە فێڵ لە منداڵ کردن و شاردنەوەی ڕاستییەکان لێی، واتە هەندێ دایك و باوك لە ژیانی ڕۆژانەدا، کاتی ڕەفتار و سەرەدەریکردن، فێل لە منداڵ دەکەن و هەوڵ دەدەن چەواشە و بەلاڕێیدا ببەن، ئەمەش یان لە نەزانینەوەیە، یاخود بە ئەنقەس گەرەکیانە هەندێ ڕاستی لە منداڵ بشارنەوە و هەندێ هەڵە وەك ڕاستی، بە منداڵ بناسێنن، لە هەموو حاڵەتەکانیشدا، زەرەرمەندی یەکەم خودی منداڵەکەیە، ئینجا دایك و باوك و کۆمەڵگە، ئەمەش بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- خەمساردی و بێباکی.
- ناوشیاری و لاوازی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوە.
- خۆسەپاندن و چەوساندنەوە.
- نەخوێندنەوەی منداڵ وەك خۆی.
- فێلبازی و تەلەکەبازی.
- هەبوونی پەروەردەیەکی ناتەندروست.
- گەورەبوونی دایك و باوك لە ژینگەیەکی ناتەندروست و ئاڵۆزدا.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- بەکارهێنانی منداڵ بۆ بەرژەوەندی کەسی، وەك دەرۆزەپێکردن و پارە کۆکردنەوە و بازرگانی پێکردن و...تاد.

ئەڵبەتـە ئەگـەر دایـك و بـاوك، فێـڵ لـە منـداڵ بکـەن، گـورزێکی کوشـندە لـە منـداڵ دەوەشـێنن! ئینجـا لـە خۆیـان و کۆمەڵگـەش بـە گشتی، کە لە چەند خاڵێکدا کورت دەکەینەوە:

- منداڵ متمانەی بە دایك و باوکی و کەسانی دەوروبەری نامێنێ و دووچاری بەدگومانی و دڵپیسی دەبێت.
- منداڵ لە دایك و باوکییەوە فێرە فێڵ و حیلەکردن دەبێت.
- منداڵ لە ڕاستی و ڕاستگۆیی دووردەکەوێتەوە.
- منداڵ بڕوا و متمانەی بەخۆی نامێنێ.
- منداڵ دووچاری لاساری دەبێت.
- لە ژیانیدا سەرکەوتوو نابێت و ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

فێلکردن وەك ژەهردارکردنی خواردن وایە، ئەگەر خواردنێکی پاك و تەندروست ژەهرداربکرێت و دەرخواردی منداڵان بدرێت، مەترسییەکی گەورە لەسەر جەستەی منداڵ دروست دەکات، هەروەها ئەگەر لە کاتی پەروەردەکردنی منداڵدا، فێڵی لێبکرێت، دەبێتە هۆی ئەوەی هزر و ناخ و دەروونـی منـداڵ ژەهـراوی ببێـت و نـەتوانێ وەك کەسـێکی دەسـتپاك و ئەمانـەتپارێز و ناخپـاك و زمانپـاك لـە پێشـڤەبردنی گـەل و نیشـتمانیدا ڕۆڵی خۆی بگێڕێت.

بۆیە پێویستە دایکان و باوکان خۆ لەم جۆرە فرت و فێڵانە بپارێزن، بەتایبەتی لەگەڵ منداڵەکانیان، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- لە هەموو حاڵەتەکاندا لەگەڵ منداڵەکانیان ڕاستگۆ بن و فێلیان لێ نەکەن.
- متمانەیەکی باش لە نێوان خۆیان و منداڵەکانیان دروست بکەن.
- وەك دۆست و هاورێ، سەرەدەری لەگەڵ منداڵ بکەن.
- هەر بابەتێك پێویستی بە ڕازیکردنی منداڵ هەبوو، هیچ شتێکی لێ نەشارنەوە و لە ڕێگەی دان و ستاندنەوە لەگەڵی باس بکەن.
- کارێکی وا نەکەن کە منداڵ هەست بکات، دایك و باوکی لەگەڵیدا ڕاستگۆ نین.
- سەرچاوەی سۆز و خۆشەویستی بن بۆ منداڵەکانیان.
- کارەکانیان بە پرس و ڕاوێژ ئەنجام بدەن.
- دەبێ دایکان و باوکان بزانن کەوا منداڵ زۆر وشیارترە لەوەی کە فێلی لێبکرێ، ڕەنگە ئەوان بتوانن جارێك یان چەند جارێك هەڵی بخەڵەتێنن، بەڵام قەت ناتوانن تاسەر هەڵی بخەڵەتێنن! چونکە بە ئاسانی دەتوانێ پەی بە فرت و فێلی دایك و باوکی ببات!
- دەبێ دایك و باوك بزانن هەر تەنیا منداڵ لەم جۆرە فرت و فێڵانە زیانمەند نییە،بەڵکو خۆشیان و کۆمەڵگەش لێی زیانمەند دەبن و جۆرێك لە بێ متمانەیی و بێ بڕوایی دروست دەبێت و هەمووان بە چاوی گومانەوە سەیری یەکتری دەکەن و ژیان دەبێت بە ژان.

## لاساییکردنەوەی خەڵکانی دیکە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵدا

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە لاساییکردنەوەی خەڵکانی دیکە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵدا، واتە دایك و باوکەکان خاوەن پلان و ستراتیژ و تەکتیکی خۆیان نین، بۆیە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیاندا، پشت بە کەسانی دەوروبەری خۆیان دەبەستن، ئەمەش هەڵەیەکی گەورە و کوشندەیە، چونکە ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی و ژینگەی خێزانی هەر تاکێك لە تاکێکی دیکە جیاوازە، بۆیە پێویستە ئەو جیاوازیانە لەبەرچاوبگیرێن و نابێ پەروەردەی خێزان بۆ خێزانێکی دیکە، یان تاکێك بۆ تاکێکی دیکە کۆپی بکرێت.

دەکرێ مرۆڤ سوود لە ئەزموونی خەڵکانی دیکە وەربگرێت، بەڵام ناکرێت منداڵەکانی خۆی، بکاتە کۆپی منداڵانی ئەوان.

ئەڵبەتە ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- نەبوونی پلان و بەرنامە و ستراتیژێکی گونجاو بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵ.
- لاوازی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی و پەروەردەیی دایك و باوك.

- ئەم جۆرە دایك و باوكانە بڕوا و متمانەیان بەخۆیان نییە، بۆیە هەمیش چاو لە كەسانی دیكە دەكەن و پشت بە كەسانی دیكە دەبەستن.
- هەبوونی حەزی لاساییكردنەوە و نەبوونی بیرۆكەی داهێنان و ئەفراندن.
- لەبەرچاونەگرتنی بەرژەوەندی منداڵ.
- ئاشنا نەبوون بە بەنەما زانستی و پەروەردەیەكان.
- نەبوونی ژینگەیەكی لەبەر بۆ پەروەردە و فێركردنی منداڵ.
- بڕوا و متمانە بەخۆنەبوون و هەبوونی هەستی خۆبەكەمزانین.
- دەستوەردان لەكاروباری خێزان.
- نەبوونی پاشخانێكی هزری و زانستی و پەروەردەیی.
- لەبەرچاونەگرتنی تایبەتمەندییەكانی منداڵ.
- سوودوەرنەگرتن لە كەسانی شارەزا و پسپۆر.

بێگومان ئەگەر دایكان و باوكان لەسەر ئەم ڕێڕەوە هەڵەیە بەردەوام بن و لە كارە ورد و درووشتەكانی پەروەردە و فێركردنی منداڵەكانیان، لاسایی ئەم و ئەو بكەنە و شانی خۆیان نەدەنە بەر ئەم بەرپرسیارەتییە مەزنە، ئەوا منداڵەكانیان ڕوویەڕووی قەیران و كێشە دەبنەوە، گرنگترین ئەو كێشانەش دەتوانین لە چەند خاڵێكدا چڕكەینەوە:

- ڕەچاوی جیاتاکییەکانی منداڵ ناکرێت.
- منداڵ بە شێوەیەك پەروەردە دەبێت، کە خەڵکانی دیکە گەرەکیانە، نەك دایك و باوك.
- ناتوانرێت وەك پێویست سوود لە توانا و بەهرەکانی منداڵ وەربگیرێت.
- منداڵ ڕووبەڕووی کێشە و قەیرانی زۆر دەبێتەوە.
- کێشە بۆ خێزان و دایك و باوك دروست دەبێت و بەدەست کێشەکانەوە گیرۆدە دەبن.
- هەمیشە چاویان لە دەستی ئەم و ئەو دەبێت.
- لە ئایندەدا کۆمەڵگە زەرەرمەند دەبێت، چونکە وەك پێویست ناتوانێ سوود لە بەهرە و تواناکانی ئەم جۆرە منداڵانە وەربگرێت.
- باری سەر شانی منداڵ قورس و گران دەبێت.
- دایك و باوکەکان بڕوا و متمانەی خۆیان لە دەست دەدەن.
- منداڵ و دایك و باوك لە ژیانی خۆیاندا سەرکەوتوو نابن.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

گەورەترین ئەرکی دایکان و باوکان بریتییە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵ لەسەر بناغەیەکی زانستی و پەروەردەیی، چونکە یەکەم وێستگە و قۆناغی پەروەردەکردنی منداڵ لە ناو خێزان دەستپێدەکات و یەکەم بەردی ئەم بناغەیەش لەسەردەستی دایکان و باوکان دێتە دانان.

بۆیە هەر جۆرە خەمساردی، بێباکی و کەمتەرخەمییەك لەلایەن دایکان و باوکانەوە هەبێت، کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر پەروەردە و فێرکردن و گەشەی منداڵ جێدێڵێ، جا بۆ ئەوەی دایك و باوك لە کاتی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیاندا، بتوانن پشت بە تواناکانی خۆیان ببەستن و خاوەن پلان و بەرنامە و ستراتیژ و تێڕوانین و دیدگەی خۆیان بن، دەبێ ئەم هەنگاوە گرنگانە بهاوێژن:

- دەبێ پلان و دیدگەیەکی تۆکمەی زانستی و پەروەردەییان هەبێت.
- بە پلەی یەکەم پشت بە بەهرە و تواناکانی خۆیان ببەستن.
- دەبێ تا ئەوپەڕی توانا، خۆیان لە چاولێکەری بپارێزن، بەتایبەتی لە بواری پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیاندا.
- پێویستە ژێرخانی هزری و زانستی و پەروەردەیی خۆیان بەهێز بکەن.
- دەبێ ئاشنابن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.

- دەبێ لە کاتی پێویستدا سوود لە ئەزموون و توانای کەسانی شارەزا و پسپۆڕ وەربگرن.
- دەبێ ئاشنا بن بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ، بۆ ئەوەی بەپێی گەشەی هەر قۆناغێك سەرەدەری لەگەڵ منداڵدا بکەن.
- دەبێ ڕەچاوی تایبەتمەندی و جیاتاکییەکانی منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ دایك و باوك تا ئەوپەڕی توانا، پێکەوە هاوکار و هەماهەنگ و هاوسۆز و هاوهەڵوێست بن، بەتایبەتی لە بواری پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان.
- دەبێ ڕەچاوی ئەو ژینگەیە بکەن، کە منداڵ تێدا گەشە دەکات، هەروەها نابێ منداڵ بەو پێوەرانە هەڵبسەنگێندرێت، کە کەسانی دیکەی پێ هەڵدەسەنگێندرێن!
- نابێ منداڵ بکرێتە کۆپی کەسێکی دیکە و وا پەروەردە بکرێت کە وەك ئەو بیربکاتەو و هەڵسوکەوت بکات.
- نابێ منداڵەکان بە منداڵانی دیکە بەراورد بکرێن.

## پشتگوێخستنی کێشە و ئارێشەکانی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە پشتگوێخستنی کێشە و ئارێشەکانی منداڵ، واتە ئەو جۆرە دایك و باوکانە، نە گرنگی بە کێشەکانی منداڵ دەدەن، نە چارەسەری گونجاویشی بۆ دەدۆزنەوە، بۆ نموونە: ئاستی منداڵ لە قوتابخانە دادەبەزێت، منداڵ درەنگ دەچێتە قوتابخانە و درەنگ لە قوتابخانە دێتەوە بۆ ماڵەوە، هەروەها منداڵ ئەرکەکانی ماڵەوە جێبەجێ ناکات و بە شێوەیەکی فەرمی و چەندین جار لەلایەن قوتابخانەوە ئاگادار دەکرێنەوە، بەڵام دایك و باوکی منداڵ مشۆری ئەم پرسە ناخۆن و هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو کێشانە نادەن و بە شێوەیەکی کردەیی فەرامۆشی دەکەن.

یاخود منداڵ شەوانە درەنگ دێتەوە ماڵەوە، دەبێتە دۆست و هاوڕێی کەسێکی خراپ و ڕابردوو ناپاك، جگەرە دەکێشێ و ...تاد. هەر چەند دایك و باوکی منداڵ ئاگاداری ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە نامۆیانەن و لەلایەن کەسانی دیکەوە ئاگادار کراونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پرسە بە هەند وەرناگرن و نایکەن بە خەمی خۆیان و فەرامۆشی دەکەن و خۆی لێ ناکەن بە خاوەن و لێی ناپرسنەوە و پشتی تێدەکەن.

ئەڵبەتە ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، کە لە چەند خاڵێکدا چڕ دەکەینەوە:

- ئەو جۆرە دایک و باوکانە هەست بە بەرپرسیارەتی ناکەن.
- ئەو جۆرە دایک و باوکانە خەمسارد و کەمتەرخەم و بێباکن.
- ئەو جۆرە دایک و باوکانە هەست بەو مەترسییانە ناکەن کە لە ئێستا و ئایندەدا ڕووبەڕووی خودی ئەوان و منداڵەکانیان و کۆمەڵگە دەبێتەوە.
- نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایک و باوک.
- ئەو ژینگەیەی کە دایک و باوک تێدا دەژین، ناتەندروستە.
- ئەو جۆرە دایک و باوکانە ئاشنا نین بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- ئەو جۆرە دایک و باوکانە ئەزموونیان کەمە لە بواری پەروەردە و فێرکردنی منداڵدا.
- ئەو جۆرە دایک و باوکانە خاوەن پلان و بەرنامەیەکی تۆکمە نین و بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەژین.
- هەندێ جار ئەو جۆرە دایک و باوکانە توانای چارەسەرکردنی کێشەکانیان نییە.

- هەندێ جار ئەو جۆرە دایك و باوكانە كۆنترۆڵیان بەسەر منداڵەكانیاندا نییە، جا بە هۆی بەناز پەروەردەكردنیان، یان فەرامۆشكردنیانەوە بێت.
- ئەو جۆرە دایك و باوكانە دوور لە واقع بیردەكەنەوە و ڕاستییە بەرجەستەكان وەك خۆی ناخوێننەوە.

شایانی ئاماژە پێكردنە، ئەگەر دایك و باوك بۆ هەر كێشەیەكی منداڵ، چارەسەرێك و، بۆ هەر زامێكی، سارێژێك و، بۆ هەر دەردێكی، دەرمانێك و، بۆ هەر ژانێكی، هەتوانێك نەدۆزنەوە، زوو یان درەنگ، منداڵەكانیان، ڕووبەڕووی كێشەی گەورە دەبنەوە و چارەنووسیان بەرەو هەڵدێر دەچێت، گرنگترین ئەو كێشانەش ئەمانەن:

- منداڵ بەدەست كۆمەڵێك كێشەی جددییەوە دەناڵێنێ، كە ڕەنگە تا كۆتا تەمەنی ژیانی لەگەڵیدا بمێننەوە!!
- منداڵ توانا و بەهرەكانی خۆی لە دەست دەدات و وەك وەرزی پایز دووچاری خەزان دەبێت!
- منداڵ لە زۆر شت بێبەش دەبێت و لە ئایندەدا بۆی قەرەبوو ناكرێتەوە، وەك لەدەستدانی خوێندن و لەدەستدانی متمانە و پشت بەخۆبەستن و ....تاد.

- منداڵ تا بینەقاقا، ڕووبەڕووی کێشە و قەیرانی جیاجیا دەبێتەوە و هەندێ لەو کێشانە تا مردن لەگەڵیدا دەمێننەوە.
- دایك و باوك وەك پێویست سود لە بەهرە و تواناکانی منداڵەکانیان وەرناگرن و لە بڕی قازانج، بە زیان بەسەریاندا دەشکێتەوە.
- کۆمەڵگە بە لەدەستدانی بەهرە و توانای ئەو جۆرە کەسانە، دووچاری زیانێکی زۆر دەبێت.
- دایك و باوك دەبنە نموونەیەکی خراپ بۆ منداڵەکانیان، چونکە زۆربەی جار منداڵ چاو لە دایك و باوك و مامۆستاکانی خۆی دەکات و دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوانەوە.
- کێشەکان هەر چەند بچووکیش بن، ئەگەر بەبێ چارەسەر مانەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبن و دواجار چارەسەرکردنیان ئەستەم و مەحاڵ دەبێت.
- زۆرجار ئەو کێشانە ئاگر لە دامێنی دایك و باوکەکان بەردەدەن و بەهۆیەوە دەسووتێن و ژیانیان لێ دەبێت بە ژان!!!

**چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە**

بۆ ئەوەی دایك و باوکەکان سنوورێك بۆ ئەو کێشە و گیروگرفتانە دابنێن کە بەرەو ڕووی منداڵەکانیان دەبنەوە، هەروەها بۆ ئەوەی زەرەر لە نیوە بگەڕێتەوە، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- نابێ دایك و باوك هیچ کێشەیەك بێ چارەسەر بهێڵنەوە، تەنانەت ئەگەر بچووکیش بێت.
- دەبێ دایك و باوکەکان پلان و بەرنامە و ستراتیژیان هەبێت بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان و، نابێ لە هیچ دۆخ و حاڵەتێکدا پشت لە منداڵ بکەن.
- دەبێ دایك و باوك بە گشت قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ ئاشنا بن.
- دەبێ دایك و باوکەکان ڕۆڵی پەروەردەکار و فێرکار و چاودێر و ڕێنماییکار و سەرپەرشتیار ببینن.
- دەبێ ڕەگ و سەرچاوەی هەر کێشەیەك بدۆزنەوە و هۆکار و پاڵنەرەکانی بزانن، بۆ ئەوەی لە ژێر ڕۆشنایی ئەو هۆکار و پاڵنەرانە، چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە.

- پێویستە پەیوەندییەکی توندو تۆڵ و پتەو لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان هەبێت و لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی و میهرەبانی دامەزرا بێت.
- دەبێ دایك و باوك هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن و خۆیان لە ئاست پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان بە بەرپرس بزانن.
- دەبێ دایك و باوك لەگەڵ یەکتری هاوکار و هەماهەنگ بن و کارەکانیان بە پرس و ڕاوێژ چارەسەر بکەن.
- دەبێ خۆیان لە کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی بەدوور بگرن.

## ڕووخاندنی وره‌ی منداڵ

هه‌ڵه‌یه‌کی دیکه له‌و هه‌ڵه باوانه‌ی که هه‌ندێ له دایکان و باوکان ئه‌نجامی ده‌ده‌ن، بریتییه له ڕووخاندنی وره‌ی منداڵ، واته، ئه‌و جۆره دایك و باوکانه له‌بڕی به‌رزکردنه‌وه‌ی وره‌ی منداڵ، له کاتی شکست و که‌وتنه‌کاندا، هه‌روه‌ها له‌بڕی ئه‌وه‌ی بۆ کار و کۆششێکی زیاتر و به‌ده‌ستهێنانی ئه‌نجامێکی باشتر هان بدرێت، په‌نا بۆ به‌کارهێنانی هه‌ندێ ڕسته‌ی نه‌شیاو و نه‌گونجاوی وه‌ك: تۆ که‌سێکی فاشیلیت، تۆ که‌سێکی ساقیتیت، تۆ که‌سێکی دۆڕاویت، تۆ که‌سێکی.... و..... ده‌به‌ن و ناخ و ده‌روونی منداڵ تێکده‌شکێنن و وا ده‌که‌ن که وره‌ی دابه‌زێت و له کاتی که‌وتندا، نه‌توانێ هه‌ستێته‌وه و له‌سه‌ر قاچه‌کانی خۆی بوه‌ستێته‌وه و به‌ره‌و ئامانجه‌کانی هه‌نگاو بنێت.

ئه‌مه‌ش بۆ چه‌ندین هۆکاری جیاجیا ده‌گه‌ڕێته‌وه، له‌وانه:

- ئه‌و جۆره دایك و باوکانه، ڕه‌شبین و به‌دبینن و، به شێوه‌یه‌کی ڕه‌شبینانه سه‌ره‌ده‌ری له‌گه‌ڵ منداڵه‌کانیان ده‌که‌ن.
- ئه‌و جۆره دایك و باوکه، نازانن هانی منداڵ بده‌ن و به‌ره‌و ئاراسته‌یه‌کی ئه‌رێنی ڕاسته‌ڕێ بکه‌ن.
- له ئاستێکی لاوازی زانستی و ڕۆشنبیری به‌هره‌مه‌ندن.
- به‌شێوه‌یه‌کی ئه‌رێنی بیرده‌که‌نه‌وه و هه‌نگاو ده‌نێن.
- چاو له که‌سانی ده‌وروبه‌ری خۆیان ده‌که‌ن.
- هه‌ستی تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه به‌سه‌ریاندا زاڵه.
- که‌سانی تووڕه و دانبه‌خۆدانه‌گر و نائارامن.
- که‌سانی خۆشباوه‌ڕن و زوو بڕیار ده‌ده‌ن.

- ئاشنا نین بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- زوو زوو هەڵدەچن و کاردانەوە لە خۆیان نیشان دەدەن.
- بیر لە بەرژەوەندی و ئایندەی منداڵ ناکەنەوە.
- چارەسەری گونجاویان نییە بۆ کێشەکان و زۆرجار کێشە بە کێشە چارەسەر دەکەن.

ئەڵبەتە بەردەوامبوونی دایک و باوکەکان لەسەر ئەم ڕێڕەوە مەترسیدارە، وا دەکات هەم خۆیان و هەم کۆمەڵگەش زەرەرمەند بێ، هەمیش منداڵەکانیان بەهرە و تواناکانی خۆیان لە دەست بدەن و ڕووبەڕووی مەترسیی جددی ببنەوە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵەکان بەم وشە ورە ڕووخێنەرانە، ورەیان دەڕووخێ و بڕوا و متمانەیان بە خۆیان نامێنێ و ناتوانن لەسەر پێیەکانی خۆیان بوەستن.
- منداڵەکان ناتوانن پشت بە بەهرە و تواناکانی خۆیان ببەستن.
- منداڵەکان لە ژیاندا ڕووبەڕووی کێشە و گرفتی گەورە دەبنەوە، چونکە بەرگەی ئەو کێشە و گرفتانە ناگرن و چارەسەریان پێ نییە.
- منداڵەکان لە کار و ئەرکەکانیاندا سەرکەوتوو نابن و بە دڵەڕاوکێ و دڕدۆنگی کار دەکەن.
- دایک و باوکەکان ناتوانن بەشێوەیەکی چاک سوود لە توانا و بەهرەکانی منداڵەکانیان وەربگرن و توانا و بەرهەکانیان دەپووکێتەوە.
- کۆمەڵگە زەرەرمەند دەبێت، چونکە وزە و سەرچاوەیەکی زۆری هزری و زانستی و مرۆڤی لە دەست دەدات.

- ئەو جۆرە منداڵانە لە دەرفەتگەلێك بێبەش دەبن کە لە ژیاندا بۆیان دەڕەخسێت.
- ژینگەی خێزان دەبێتە سەرچاوەی کێشە و گرفتەکان.
- لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکان، کێشەکانیشیان گەورە دەبێت.
- ئەگەر منداڵەکان لە بەهرە و توانایەکی چاکیش بەهرەمەند بن، بەو سەرەدەرییە نەرێنییە کە دایك و باوکەکانیان لەگەڵیان ئەنجامی دەدەن، ناتوانن ئەو بەهرە و تواناییانە بخەنە کار و سەرمایەگوزاری بکەن.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

هەموو مرۆڤێك، نەخاسمە منداڵ، لە ژیانی ڕۆژانەدا پێویستی بە هاندان و پاڵپشتیکردن هەیە، بۆ ئەوەی لەسەر کاری چاك بەردەوام بێت و بتوانێ باشتر سوود لە بەهرە و تواناکانی خۆی وەربگرێت و چاکتر هەڵ و دەرفەتەکان بقۆزێتەوە و هەمبەر کێشە و ئارێشەکانی ژیان خۆڕاگرتر بێت.

جا بۆ ئەوەی منداڵ بە شێوەیەکی ئاسایی گەشە بکات و سوود لە توانا و بەهرەکانی خۆی وەربگرێت، دەبێ دایك و باوکەکانی ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- پێویستە دایك و باوك هەمیشە پشت و پەنای منداڵەکانیان بن و لە دۆخە سەخت و دژوارەکاندا بەجێیان نەهێڵن.

- دەبێ دایک و باوک بزانن چۆن و بە چ شێوەیەک ڕەفتار و سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن، نەخاسمە لە دۆخە ناخۆشەکاندا.
- دەبێ دایک و باوک، پەی بە بەهرە و تواناکانی منداڵەکانیان ببەن.
- نابێ دایک و باوک، شتێک لە منداڵ داوا بکەن، کە بەدەر بێت لە بەهرە و تواناکانی ئەو.
- نابێ دایک و باوک، وشەی ورە ڕووخێن بەکاربێنن، بەڵکو پێویستە لەبری ئەوە، هانی منداڵ بدەن بۆ کار و کۆششی زیاتر و بەدەستهێنانی سەرکەوتنی گەورەتر.
- نابێ دایک و باوک، منداڵەکانیان بە منداڵەکانی خەڵکانی دیکە بەراورد بکەن.
- دەبێ دایک و باوک، ژینگەیەکی لەبار و گونجاو بۆ گەشەکردنی منداڵ لە گشت ڕوویەکەوە، بەتایبەتی لە ڕووی هزری و جەستەیی و زانستی و کۆمەڵایەتی و دەروونییەوە لە ناو خێزان فەراهەم بکەن.
- دەبێ دایک و باوک ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- دەبێ دایک و باوک لە کاتی پێویست سەردانی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا بکەن و سوود لە توانا و بەهرەکانیان وەربگرن.
- برەودان بەو هۆکارگەلانە، کە دەبنە هۆی بەرزکردنەوەی ورەی منداڵ.

## خۆدزینەوە لە وەڵامی پرسیارەکانی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە خۆدزینەوەیان لە وەڵامی پرسیارەکانی منداڵەکانیان. واتە، دایك و باوکی وا هەیە، کاتێ منداڵەکانیان پرسیاری لێ دەکەن، تاقەتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان نییە، یان نایانەوێ وەڵامیان بدەنەوە، یاخود نازانن وەڵامیان بدەنەوە، لە هەموو حاڵەتێکیشدا، وەڵامنەدانەوەی پرسیارەکانیان، پرسیار لای خودی منداڵەکان دروست دەکات، ئاخۆ بۆچی وەڵاممان نادەنەوە و خۆیان لە پرسیارەکانمان دەبوێرێن؟!!!

ئەڵبەتە هەموو منداڵێك لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانیدا کۆمەڵێك پرسیاری جۆراجۆری لا دروست دەبێت و حەز دەکات وەڵامی ئەو پرسیارانە لە دایك و باوکی دەست کەوێت، بەتایبەتی لە تەمەنی زوودا، چونکە پێی وایە دایك و باوکی هەموو شتێك دەزانن!!

ئەڵبەتە ئەو پرسیارانەش جۆراجۆرن، لەوانە:

**پرسیار لەبارەی ناولێنراوەکان:** منداڵ حەزی لێیە لەبارەی ناوی مرۆڤەکان یان شتەکان یان ئاژەڵەکان یان باڵندەکان و ... پرسیار بکات و شتی نوێ بزانێت.

**پرسیار لەبارەی کات و شوێنەکان:** منداڵ کە دەچێتە شوێنێك، حەز دەکات ناوی ئەو شوێنە بزانێت، بۆیە هەمیشە و هەنگاو بە هەنگاو لەسەر هێلە بۆ ئەوەی لە دایکی یان باوکی بپرسێت ئێرە کوێ یە، ناوی

چییە؟ یان کاتێ شەو دێت یان خۆر هەڵدێت، یان ئەستێرەکان لە ئاسماندا دەدرەوشێنەوە، یان مانگ بە شێوە و شوکلی جیاجیا دەبینرێت، حەز دەکات بزانێت ئەم هەموو گۆڕانکارییە بۆچی و لەپای چی؟!!

**پرسیار لەبارەی دەستخستنی زانیاری:** منداڵ هەمیشە حەزی لە زانیاری نوێیە، واتە، دەیەوێ لە ڕێگەی پرسیارگەلێکەوە، زۆرترین زانیاری کۆکاتەوە و لای خۆی گلداتەوە، بۆیە لە پرسیارکردن شەکەت نابێ و تا دەرفەتی پێ بدرێت، ئەو بەردەوام دەپرسێ....

**پرسیاری خۆپاراستن:** زۆرجار منداڵ حەز دەکات لەبارەی هەندێ شتەوە کە لێی نازانێ یان لێی دەترسێ یان لێی نیگەرانە، لە دایك و باوکی بپرسێ و زانیاری نوێ دەستبخات، بۆ ئەوەی خۆی لەو شتگەلانە بپارێزێت، یان دڵی ئاو بخواتەوە و خاترجەم بێت. بۆ نموونە حەز دەکات بزانێت زیانەکانی هەورەتریشقە چییە؟ یان ئۆتۆمبێل بۆچی بۆق لێدەدات؟ یان بۆچی لە وەرزی زستان ئاو هەڵدەستێت و...تاد

**پرسیاری فزوولی و مایتێکەری:** هەندێ جار منداڵ فزوولی و مایتێکەری دەکات و سوور دەزانێت ئەو بابەتە پەیوەندی بە خۆیەوە نییە، بەڵام حەز دەکات دەست لەو کارە وەربدات، بۆیە لە ڕێی پرسیارکردنەوە، لە دەرگای ئەو بابەتە دەدات!

**پرسیاری ورووژاندن:** زۆرجار منداڵ هەندێ پرسیار دەورووژێنێ و حەز دەکات لەو ڕێگەیەوە ڕاوبۆچوونی دایك و باوکی بزانێ و وەڵامێکی ڕاستی دەستکەوێت، بۆ نموونە لە دایك و باوکی دەپرسێت: بۆچی ناچینە دهۆك، یان سلێمانی؟ یان بۆچی فلان یان فیسار کەس سەردانی ماڵمان ناکات؟

**پرسیاری تاقیکردنەوە:** زۆرجار منداڵ حەز دەکات کەسانی دەوروبەری خۆی، بەتایبەتی دایك و باکی تاقی بکاتەوە ئاخۆ دەزانن یان نا، بۆیە پرسیارگەلێك ئاراستەیان دەکات و دەیەوێ گوێبیستی ئەوان بێت، ئاخۆ بەڕاستی وەلامی دەدەنەوە، یان زانیارییەکانی لێ دەشارنەوە.

بۆ نموونە منداڵ لە ڕێی کەسێکی نزیك لەخۆیەوە هەواڵێکی زانیوە، بۆیە کە هاتە ماڵەوە، لە دایکی یان باوکی یان خوشك و براکانی دەپرسێ: ئایا ئەم شتە ڕوویداوە یان نا؟ لە بنەڕەتدا ئەو دەیزانێ شتەکە ڕوویداوە، بەڵام دەیەوێ تاقییان بکاتەوە و لە ڕاستی و دروستی هەواڵەکە دڵنیا و خاترجەم بێت.

هەروەها شێوازی پرسیارکردنی منداڵان، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە جیاوازە، بۆ نموونە: لە قۆناغی منداڵیدا، بەتایبەتی لە تەمەنی (٥-٢)ساڵی، منداڵ حەز دەکات بزانێت لە هەرچوار دەوری چی دەگوزەرێت؟ بۆیە پرسیار لەبارەی ئەو شتانەوە دەکات کە لێی

دەترسێت وەك: شەو، هەورە تریشقە، گڤە گڤی با، ژیان، مردن، فریشتە، شەیتان، جنۆکە. یان حەز دەکات لەبارەی هەندێ ناو یان شت یاخود ڕووداو، زانیاری وەربگرێ، وەك: جیاوازی نێوان نێر و مێ، سکپڕی دایك، چۆنیەتی پەیدابوونی منداڵ، هەروەها زۆر جار دەپرسن خوا لە کوێ یە؟ یان باران چۆن دەبارێت و...تاد.

لەسەر هەموو ئەو پرسیارانەش، حەز دەکات وەڵامی دەستکەوێت.

یاخود لە قۆناغی هەرزەکاریدا: کچ و کوڕە هەرزەکارەکان پرسیار لەبارەی هەراش(بالق)بوون، سوڕی مانگە، گۆڕنکاری جەستەیی، شووکردن، ژنهێنان، قەد و باڵا و درێژی و بەرزی، جۆری ڕەنگەکانی جلوبەرگ و.... دەکەن و حەز دەکەن ئەو وەڵامانەیان لە دایك و باوکەکانیان دەستکەوێت، بەڵام زۆرێك لە دایکان و باوکان خۆیان لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە دەدزنەوە، جا چ بە ئەنقەست بێت یان بە نەزانین بێت.

ئەڵبەتە ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەو جۆرە دایك و باوکانە پرسیارەکانی منداڵ بەهەند وەرناگرن.
- هەندێ جار بەدەست ئەو جۆرە پرسیارانەوە وەڕەس دەبن و فەرامۆشی دەکەن.
- زۆرجار بە پێویستی نازانن وەڵامی منداڵەکانیان بدەنەوە.

- هەندێ جار دایك و باوك بە هۆی سەرقاڵییەوە دەرفەتی ئەوەیان نییە بە وردی گوێ لە وەڵامی پرسیارەکانی منداڵەکانیان بگرن و وەڵامیان بدەنەوە.
- هەندێ جار دایك و باوك وەڵامی هەندێ پرسیار نازانن، بۆیە خۆیان دەبورێن و خۆیان دەدزنەوە.
- ئەو جۆرە دایك و باوکانە، لەسەر کێشە و گرفتەکانیان، نارامگر و دانبەخۆداگر نین و تاقەتی ئەوەیان نییە وەڵامی یەکە بە یەکەی پرسیارەکانی منداڵەکانیان بدەنەوە.
- نەخوێندەواری و نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك بەردەوام بن لەسەر هەڵەی خۆیان و خۆیان لە پرسیارەکانی منداڵەکانیان بدزنەوە، نەك هەر تەنیا منداڵەکانیان، بگرە خۆیان و کۆمەڵگەش زەرەر ەکات، چونکە زۆرجار حەزی زانین و فێربوون وا لە منداڵەکان دەکات، بیر لە ڕێگەی دیکە بکەنەوە، بۆ ئەوەی زانیاری نوێ دەست بخەن، یەکێك لەو ڕێگەیانەش ئەنتەرنێتە، یان هاوڕێ یە، یان پەرتووکەکانی تایبەتمەندە لەو بوارە.

بۆیە خۆدزینەوەی دایکان و باوکان لە پرسیارەکانی منداڵەکانیان، زیانێکی زۆر بە خودی منداڵ و خێزان و کۆمەڵگە دەگەیەنێت، لەو زیانانە:

- منداڵ پێی وایە دایك و باوکی هەموو شتێك لەبارەی ژیانەوە دەزانن، بۆیە کە دەبینێ وەڵامی نادەنەوە، دووچاری بەدگومانی

دەبێت و بڕوا و متمانەی بەوان نامێنێ، یاخود وا هەست دەکات کە دایك و باوکی وەڵامی پرسیارەکانی دەزانن، بەڵام خۆیان لە گێلی دەدەن و حیسابی بۆ ناکەن، ئەمەش وا دەکات کە بۆ دەستکەوتنی وەڵامەکانی، پەنا بۆ کەسانی دیکە ببات لە دەرەوەی ژینگەی خێزان.

- بەربەست لە ڕێی گەشەکردنی منداڵ دروست دەبێت.
- منداڵ بە ترسەوە پرسیار دەکات.
- منداڵ بەهۆی دەستنەکەوتنی وەڵام، دووچاری جۆرێك لە ترس و دڵەڕاوکێ دەبێت.
- کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر گەشەی منداڵ جێدێڵێ، بەتایبەتی گەشەی هزری و زانستی.
- پەیوەندی نێوان دایك و باوك و منداڵ بەرەو ساردی و سڕی دەچێت.
- ئەم جۆرە دایك و باوکە، منداڵی خۆیان لە زۆر زانیاری و شتگەل بێبەش دەکەن، کە ڕۆژانە پێویستی پێیەتی فێری ببێت.
- منداڵ هەست بە خۆبەکەمزانین دەکات.
- منداڵ لە ژیانی خۆیدا، دووچاری ئاستەنگ و کێشە دەبێتەوە.
- منداڵ بەشێوەیەکی ناتەندروست سەرەدەری لەگەڵ زۆر بابەتدا دەکات و زیان بەخۆی و خێزانی و کۆمەڵگە دەگەیەنێت .

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

دەبێ دایك و باوك ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە بزانن کەوا پرسیارکردنی منداڵ لە قۆناغە جیاجیاکاندا، نەك هەرشتێکی ئاساییە، بەڵکو پێویستیشە، چونکە ئەم ڕەمەك(غەریزە)یە لە هەموو کەسێکدا هەیە و دەبێ منداڵ لە ڕێگەی پرسیارکردنەوە ڕەمەکی خۆی تێر بکات، ئەگەر نا، زیانی پێدەگات.

جا بۆ ئەوەی دایك و باوك بە شێوەیەکی تەندروست سەرەدەری لەگەڵ پرسیاری منداڵەکانیان بکەن، دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- دەبێ دایك و باوکەکان ئاشنا بن بە سروشت و قۆناغەکانی گەشەی منداڵەکانیان.
- دەبێ دایك و باوك بزانن چۆن و بە چ شێوازێك وەڵامی پرسیاری منداڵەکانیان دەدەنەوە، واتە، نابێ منداڵەکان لەسەر پرسیارەکان سەرکۆنە بکرێن یان تەریق بکرێنەوە یان توندوتیژییان بەرامبەر بەکاربهێندرێت، یان وا خۆیان نیشان بدەن کە نازانن، یان بە هەڵە و ناڕاست وەڵامیان بدەنەوە، تاکو زیان بە منداڵ و ئەو پەیوەندی و سۆز و خۆشەویستییە نەکەوێت کە لە نێوانیاندا هەیە، هەروەها دەبێ پرسیارەکانیان پۆلێنبەندی بکرێت: بۆ نموونە پرسیار هەیە پێویستە وەڵام بدرێتەوە، پرسیار هەیە پێویستە بە حیکمەت و لێزانی و هەستیاری وەلام بدرێتەوە، پرسیار هەیە دەکرێ دواتر وەلامی

بدرێتەوە، پرسیار هەیە دەکرێ هەر وەلامی نەدرێتەوە، بەڵام دەبێ لە ڕێگەی دان و ستاندنەوە قەناعەت بۆ منداڵ دروست بکرێت، پرسیاریش هەیە ڕەنگە بەزەحمەت وەلام بدرێتەوە، بۆیە دەکرێ تەنیا وەلامێکی کورت و پوختی منداڵ بدرێتەوە، بۆیە دەبێ دایک و باوکەکان خۆیان بۆ هەموو ئەم سیناریۆیانە ئامادە بکەن بۆ ئەوەی بەبێ زیان ئەم هەلومەرجە تێپەڕێنن...

- دەبێ دایک و باوکەکان بزانن پرسیارکردن بۆ منداڵ هەم ڕەمەکە، هەمیش پێویستی، زۆرجاریش تام و چێژی لێ وەردەگرێت، بۆیە دەبێ بە شێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە سەرەدەری لەگەڵدا بکرێت.
- دەبێ هەموو دایک و باوکێک لە قۆناغە جیاجیاکاندا، خۆی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی منداڵەکانیان، ئامادە بکەن.
- دەبێ دایک و باوک ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- دەبێ دایک و باوک لە کاتی پێویست سوود لە کەسانی شارەزا و پسپۆر وەربگرن.
- دەبێ دایک و باوک لە سەرەدەریکردنیاندا، تا ئەوپەڕی توانا ئارام و دانبەخۆداگر بن، لەمبارەیەوە بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە هەیە، لەسەر ئارامی باوکێک، کەوا چۆن هەمبەر پرسیارەکانی کوڕە بچکۆلانەکەی، دانی بەخۆدا گرتووە، بەسەرهاتەکە ئاوایە: "باوک، تەمەنی ٨٥ ساڵ بوو، کوڕەکەیشی تەمەنی ٤٥ ساڵ بوو، ڕۆژێک

هــەردووکیان لــە ماڵــەوە بــوون، قەلەڕەشــێك هاتــە ســەر داری حەوشەکەیان، باوکەکە پرسیاری لە کوڕەکەی کرد: ڕۆڵە ئەمە چ باڵندەیەکە؟

کوڕ: بابەگیان ئەوە قەلەڕەشە!

باوك دووبارە پرسیاری کردەوە، ڕۆڵە ئەوە چ باڵندەیەکە؟!!

کوڕ: بابە ئەوە قەلەڕەشە!!

پاش کەمێك، دیسان باوکەکە پرسیارەکەی سێیبارە کردەوە؟

کوڕەکەی تووڕە بوو و ئارامی لێ بڕاو و دەنگی هەڵبڕێ و هاواری کرد: بابە ئەوە چەند جارە پێت دەڵێم ئەمە قەلەڕەشە.. قەلەڕەش... بۆ تێناگەیت؟!!!!!

ئینجــا باوکەکــەی، هەســتا ڕۆیشــتە ژوورەکــەی خــۆی و دەفتــەر یاداشتەکانی خۆی دەرهێنا، کە بەسەرهاتەکانی تێدا تۆمار کردبوو.

لاپەڕەکانی هەڵدایەوە، تا گەیشتە ئەو لاپەڕەیەی کە مەبەستی بوو، ئینجا داوای لە کوڕەکەی کرد، کە بەدەنگی بەرز بۆی بخوێنێتەوە!

کوڕەکە دەستی بە خوێندنەوەی یاداشتی باوکی کرد: ئەمڕۆ کوڕم تەمــەنی ســێ ســاڵ تــەواو دەکــات، هــەردووکامان لــە نــاو حەوشــەی ماڵەکەمانــدا دانیشــتبووین، قەلەڕەشــێك لەســەر یــەکێك لــە دارەکــانی حەوشەکەمان نیشتەوە، کوڕەکەم پرسیاری لێکردم:

بابە ناوی ئەم باڵندەیە چییە؟

منیش بە هێمنی وتم: ڕۆڵە گیان ئەوە قەلەڕەشە!

دیسا پرسیاری کردەوە، ناوی ئەم باڵندەیە چییە؟

دیسان لەسەرەخۆ و بەهێمنی وەڵامم دایەوە، ڕۆڵە گیان ئەوە قەڵەڕەشە

کوڕەکەم (٢٣)جار هەمان پرسیاری دووبارەی کردەوە و هەر وتی: ناوی ئەم باڵندەیە چییە؟

منیش لەسەرخۆ و بە پێکەنینەوە، (٢٣)جار وەڵامی کوڕەکەمم دایەوە و لە باوەشم گرت و ماچم کرد و تێمگەیاند کە ئەوە قەڵەڕەشە!!!

کاتێ کوڕەکە لە خوێندنەوەی یاداشتەکە تەواو بوو....

زۆر شەرمەزار بوو، ئەوسا هەستی کرد کە جیاوازی نێوان باوك بوون و کوڕبوون چییە!!!"

## زایەکردنی سپاردە(ئەمانەت)

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە زایەکردنی سپاردە، جا سپاردە و ئەمانەتەکە ماددی بێت یان مەعنەوی، کەم بێت یان زۆر، پەیوەندی بە منداڵەوە هەبێت یان بە کەسانی دیکەوە، گرنگ ئەوەیە، بە زایەکردنی سپاردە، دایك و باوك برِوا و متمانەی خۆیان لەدەست دەدەن و ئیدی ئەستەمە بتوانن قەناعەت بە منداڵ بکەنەوە کە ئەوان لە هەموو بوارێکدا چاوساغی ئەون!! یان ئەستەمە بتوانن ئەو قەناعەتە بۆ منداڵ دروست بکەن کە سپاردە پارێز بێت و هەمان هەڵەی ئەوان دووبارە و چەندبارە نەکاتەوە.

بۆ نموونە: کاتێ منداڵ یەکێك لە نهێنییەکانی خۆی بۆ دایکی یان باوکی دەگێڕێتەوە، بەڵام حەز ناکات جگە لە وان کەسی دیکە ئەو نهێنییە بزانێت، بەڵام دایکی یان باوکی، بەبێ مۆڵەت و ئاگادارکردنەوەی منداڵەکە، ئەو نهێنییە بۆ خەڵکی ئاشکرا بکات و بڵاوبکاتەوە!

ئەم حاڵەتە، سەرەڕای نیگەران کردن و تووڕەکردنی منداڵەکە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵ جارێکی دیکە نهێنییەکانی خۆی بە دایك و باوکی نەبێژێتەوە و بەئاسانی برِوا و متمانەیان پێنەکاتەوە!

یان کاتێ دایك، لە پێش چاوی منداڵ، دەست بۆ شتی دوکاندارێك دەبات و دەخاتە ناو جانتاکەیەوە، ئیدی لەو رۆژە بەدواوە ئەستەمە بتوانێ قەناعەت بۆ منداڵەکەی دروست بکات کە دەست بۆ شتی خەڵکی نەبات و دزی نەکات!!!!

یان کاتێ باوك لە پێش چاوی منداڵەکەی، بڕە پارەیەك لەسەر زەوی، یان لە وێستگەی پاس هەڵدەگرێتەوە و دەخاتە گیرفانییەوە، دواتر هەر بەو پارەیە شتێك بۆ منداڵەکەی یان ماڵەوە دەکڕێت! ئەستەمە قەناعەت بە منداڵەکەی بکات و وا پەروەردەی بکات کە هەر کاتێ لە قوتابخانە یان شەقام یاخود لە هەر شوێنێکی دیکە، شتێکی دۆزییەوە، بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی!!!!

ئەڵبەتە زایەکردنی سپاردە لەلایەن هەندێ لە دایکان و باوکانەوە بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هۆکاری بۆماوەیی.
- گەورەبوونی دایك و باوك لە ناو ژینگەیەکی ناتەندروست دا.
- چاوچنۆکی و لاساری.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- خراپی ڕەوشی ئابووری.
- دوورکەوتنەوە لە بەها ڕەوشتی و ئایینییەکان.
- سەروەرنەبوونی یاسا.
- لاساییکردنەوەی کەسانی دیکە.
- هەبوونی گرێی دەروونی و...تاد.

بێگومان زایەکردنی سپاردە لەلایەن دایکان و باوکانەوە، هەر تەنیا زیان بەخۆیان ناگەیەنێت، بەڵکو زیان بە بەرژەوەندی منداڵ و خێزان و کۆمەڵگەش دەگەیەنێت، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ لە ڕێگەی دایك و باوکییەوە فێرە زایەکردنی ئەمانەت دەبێت و دەبێتە کەسێکی دەستپیس!!

- منداڵ بڕوا و متمانەی بە دایك و باوكی نامێنێ.
- كێشە و گرفت بۆ دایك و باوك و خێزان و كۆمەڵگە دروست دەبێت و بێ متمانەیی و بەدگومانی لەناو خەڵكیدا بڵاودەبێتەوە.
- منداڵ كۆمەڵێك بەهای وەك: ڕاستگۆیی و دەستپاكی لەدەست دەدات.
- منداڵ لە ئەرك و كارەكانیدا دەستپاك نابێت و لە ژیانی خۆیدا ڕووبەڕووی كێشەی مەزن دەبێتەوە.
- منداڵ فێرە چاولێكەری نەرێنیی دەبێت.
- منداڵ خوو بەو كارەوە دەگرێت، كە گەروەش بوو، بەدەستییەوە دەناڵێنێ.
- دایك و باوك بە زایەكردنی سپاردە، ناتوانن ببنە نموونەیەكی چاك بۆ منداڵەكانیان.

### چارەسەركردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ لە ناخەوە هەست بە متمانە بكات و بڕوایەكی پتەوی بە دایك و باوكی هەبێت، پێویستە لەسەر دایك و باوكی، تا ئەوپەڕی توانا هەوڵ بدەن لە گشت كایەكانی ژیاندا بە شێوەیەكی تەندروست سەرەدەری لەگەڵ منداڵدا بكەن و نەكەونە داوی هەڵە و تەڵەوە، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش، پێویستە ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگرن:

- پێویستە لە سەرەدەریكردندا، لەگەڵ منداڵەكانیان، ورد و ڕاستگۆ بن و خۆیان لە چەواشەكاری و فێلبازی و درۆ و ساختەكاری بپارێزن.

- بە کردەوە بسەلمێنن کە دەستپاك و ئەمانەتپارێزن و سپاردە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێننەوە.
- کرداریان، ڕەنگدانەوەی گوفتاریان بێت و ئەوەی دەبێژن، لە گۆڕەپانی کارکردندا بسەلمێنن.
- پێویستە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان دایکان و باوکان و منداڵەکانیان هەبێت، لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی و ڕێزگرتن.
- متمانەیەکی پتەو لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان هەبێت.
- پێویستە دایکان و باوکان پابەند بن بە پەیمان و بەڵێنەکانیانەوە و خۆیان لە پەیمان شکاندن و درۆکردن بپارێزن.

## زیاد لە حەد بەرگریکردن لە منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکانی دەمارگیر ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە زیاد لە حەد بەرگریکردن لە منداڵ، واتە هەندێ دایك و باوك، بێ ئەندازە بەرگری لە منداڵەکانیان دەکەن، تەنانەت ئەگەر منداڵەکانیان لەسەر هەقیش نەبن یاخود هەڵەشیان ئەنجام دابێت یان بەهەڵەشداچووبن و تێوەگلابن، ئەوان وەك پارێزەرێك بەرگری لە منداڵەکانیان دەکەن، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێکی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەم جۆرە دایك و باوکانە کەسانی بیرتەسك و دەمارگیرن، بۆیە هەمیشە منداڵی خۆیان پێ ڕاستترە لە منداڵی خەڵکی، تەنانەت ئەگەر منداڵی خەڵکی ڕاست و هەقیش بێت!
- ئەم جۆرە دایك و باوکانە، کورتبین و ناواقع بینن، بۆیە بەباشی بیر لە بەرژەوەندی منداڵ ناکەنەوە.
- ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری ئەم جۆرە دایك و باوکە نزمە.
- لە خێزانێکی داخراودا گەورەبوون و ئینتمایەکی بەهێزیان بۆ ئەندامانی خێزان هەیە.
- زوو زوو بڕیار لەسەر کێشە و گرفتەکان دەدەن، پێش ئەوەی ڕاستییەکان بزانن.
- منداڵەکانی خۆیان بەناز پەروەردەکردووە.
- ئەوەی بۆ خۆیان خۆش دەوێت، بۆ ئەوانی دیکە خۆش ناوێت.
- ئاشنا نین بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- ئارام و دان بەخۆداگر نین و زوو زوو هەڵدەچن.

- کێشە و گرفتی خێزانییان هەیە.

ئەڵبەتە ئەگەر ئەم جۆرە دایك و باوکانە لەسەر ئەو ڕێڕەوە بەردەوام بن و هەڵەی خۆیان ڕاستنەکەنەوە، زیانێکی زۆر بە منداڵەکانیان دەگەیەنن، کە لەم چەند خاڵەدا چڕ دەکەینەوە:

- منداڵ وا هەست دەکات هەمیشە لەسەر هەق و ڕاستییە، ئەمەش ڕووبەڕووی کێشە و گرفتێکی زۆر دەکاتەوە و ناتوانێ ئەم بارە قورسە هەڵگرێ.
- منداڵ ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێ و هەمیشە چاوی لە دایك و باوکی، یان ئەم و ئەو دەبێت، بۆ ئەوەی بێن بەرگری لێ بکەن.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی سەرەڕۆ و لاسار و پڕدەداتە ئەم و ئەو.
- منداڵ ناتوانێ خۆی لەگەڵ هاوڕێ و هاوسێ و دەوروبەر و خەڵکیدا بگونجێنێ، بەپێچەوانەوە هەمیشە لەگەڵیاندا لە بگرە و بەردە و کێشمەکێشمدا دەبێت.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز.
- منداڵ لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.
- دایك و باوك هەمیشە بەدەست کێشەی ئەم جۆرە منداڵانەوە دەناڵێنن و قوربانییەکی زۆری ماددی و مەعنەوی دەدەن.
- کۆمەڵگە، لە بوونی ئەم جۆرە کەسە لاسار و سەرەڕۆیانە زیانمەند دەبێت و ناتوانێ سوو لە توانا و بەهرەکانیان وەربگرێت و بخاتە ڕاژەی خۆیەوە.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان بێ ئەندازە و زیاد لە پێویست بەرگری لە منداڵەکانیان نەکەن و ئەم کارە بەسەریاندا نەشکێتەوە و زیان بە بەرژەوەندی خۆیان و منداڵەکانیان نەگەیەنێت، پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- نابێ کەسانی بیرتەسك و دەمارگیر بن.
- نابێ منداڵەکانیان بەناز پەروەردە بکەن.
- نابێ زوو قەزاوەت بکەن و زوو بڕیار بدەن، تا ڕاستی و ناڕاستی لێکجیانەکەنەوە.
- دەبێ ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- دەبێ لە کاتی پێویست سەردانی کەسانی شارەزا و پسپۆڕ بکەن.
- نابێ منداڵەکانیان بەڕەڵا بکەن.
- دەبێ ڕۆژانە چاودێربن بەسەر کاری منداڵەکانیانەوە.
- دەبێ بە هەڵەی منداڵ بڵێن هەڵە، بۆ ئەوەی لەو سنوورە بوەستێت و دووبارە و چەندبارەی نەکاتەوە.
- نابێ دایك و باوك بەشێوەیەکی کوێرانە بەرگری لە هەڵەی منداڵ بکەن.
- لە کاتی ئەنجامدانی کاری خراپ و ناشیاو، نابێ منداڵ لەلایەن دایك و باوکییەوە پاڵپشتی و پشتیوانی بکرێت.
- دەبێ سینە فروان و ئارامگر و دانبەخۆداگر بن.
- دەبێ پێش ڕووداوەکان نەکەون و بەشێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە کێشەکانیان چارەسەر بکەن.
- دەبێ خۆیان لە کێشە و بەربەرەکانێ و ململانێ بپارێزن.
- دەبێ هەمیشە بەشێك بن لە چارەسەر، بەشێك نەبن لە کێشە.

## هەم گەزیان بەدەستە، هەمیش مەقەس

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکانی دیکتاتۆر و خۆسەپێن ئەنجامی دەدەن، ئەوەیە، لە هەموو کاروبارەکانی ژیاندا، هەم گەزیان بەدەستە، هەمیش مەقەس، واتە، خۆیان بڕیار لەسەر هەموو شتێك دەدەن و هیچ حسابێکی وا بۆ منداڵەکانیان ناکەن، کە هەست بە بوونی خۆیان بکەن و گوزارشت لە ماف و داواکاریەکانیان بکەن، بە واتایەکی دیکە، ئەو جۆرە دایك و باوکانە وەك ڕۆبۆت سەیری منداڵەکانیان دەکەن و بە کەیفی خۆیان جووڵە و ئەم بەر و ئەوبەریان پێدەکەن!!!

ئەمەش بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری ئەو جۆرە دایك و باوکانە.
- هەبوونی حەزی خۆسەپاندن و تاکڕەوی و خۆپەرستی!
- ئاشنا نەبوون بە مافەکانی منداڵ.
- هەبوونی هەستی خۆ بە زلزانی.
- بە چاوێکی کەم سەیرکردنی منداڵەکانیان.
- بڕوا و متمانە نەبوون بە منداڵەکانیان.
- چاولێکەری.
- ئاشنا نەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- بێبەشبوونی خێزان لە مەبدەئی پرس و ڕاوێژ.
- زوو بڕیاردان لە کارو بارەکان، بەبێ وردبوونەوە و سەرنجدان.

ئەڵبەتــە، ئەگــەر دایــك و بــاوك ڕژد بــن لەســەر ئــەم جــۆرە سەرەدەریکردنە هەڵەیە لەگەڵ منداڵ، جگە لـە منـداڵ، خۆشـیان و کۆمەڵگەش زەرەرمەند دەبێت، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ لە ژیانی خۆیدا دەبێتە کەسێکی بێ ویست و ئیرادە و وەك ئامێرێك دەبێت بە دەست ئەم و ئەوەوە.
- منـداڵ لـە ڕووی دەروونییـەوە دادەڕووخێـت و بـڕوا و متمانـەی بـە خۆی نامێنێت.
- منداڵ هەست بە جەور و ستەم دەکات و حەزی تۆڵەسـەندنەوە لـە ناخیدا چەکەرە دەکات.
- منـداڵ ڕووبـەڕووی کێشـە و گرفتـی گـەورە دەبێتـە، بەتایبـەتی لەگەڵ هاوڕێیانی و لە قوتابخانە و کۆڵان و گۆڕەپانی یاری.
- دڵـی منـداڵ پـڕ دەبێـت لـە بـوغز و کـین، بەتایبـەتی بـۆ دایـك و باوکی.
- منـداڵ گۆشـەگیر و دوورەپـەرێز دەبێـت و لـە هـاوڕێ و دۆسـتانی دووردەکەوێتەوە.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی شەرمن و کەمڕوو.
- دایـك و باوکـەکان نـاتوانن بەشـێوەیەکی سـەرکەوتووانە سـوود لـە بەهرە و تواناکانی منداڵەکانیان وەرگرن.
- دایك و باوك دەبنە ڕێگر لـە بـەردەم گەشـەکردنی منداڵـەکانیان لـە گشت ڕوویەکەوە.
- کۆمەڵگە لە توانا و بەهرەکانی ئەو جۆرە منداڵانە بێبەش دەبێت.

- دایـك و بـاوك لـه ئاینـدەدا نـاتوانن ئـەو زیانانـه بـۆ منداڵـەكانیان قەرەبوو بكەنەوە.
- منداڵـەكان كـه گـەوره بـوون، چـاو لـه دایـك و باوكیـان دەكـەن و هەمان نەخشه و ڕۆڵی ئەوان دەگێڕن و پیاده دەكەن.

## چارەسەركردنی ئەم هەڵەیە

نابێ دایكان و باوكان وا بیربكەنەوە كه خۆیان هەموو شتێكن و منداڵەكانیشیان هیچ نین، بەڵكو دەبێ بتوانن هاوسەنگی نێوان خۆیان و ئەوان بپارێزن، تاكو نه شیش بسووتێت، نه كەباب!

بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش پێویسته ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكەن:

- دەبێ سنووری خۆیان نەبەزێنن و ڕێز له مافی ئەوانی دیكه بگرن، بەتایبەتی منداڵەكانیان.
- دەبێ بەشێوەیەكی دادپەروەرانه سەرەدەری لەگەڵ منداڵەكانیان بكەن.
- دەبێ خۆیان له هەموو جۆره ستەمێك بپارێزن.
- دەبێ ڕێز له بەها مرۆڤییەكان بگرن و پێشێلی نەكەن.
- نابێ دایـك و بـاوك قورغكـاری بكـەن و دەسـت بەسـەر هـەموو شتێكدا بگرن.
- دەبێ بەرپرسیارییەتییەكان دابەش بكەن و بەشێك له بەرپرسیارەتی به منداڵ بدرێت، بۆ ئەوەی زیاتر هەست به بەرپرسیارەتی بكات.

- دەبێ کارێکی وان نەکەن کە منداڵ هەست بەوە بکات کە ستەمی لێ دەکرێ یان مافی پێشێل دەکرێت، چونکە بیر لە تۆڵەسەندنەوە دەکاتەوە.
- دەبێ ئاشنا بن بە بنەماکانی مافی مرۆڤ و مافی منداڵ و پێوەرە زانستی و پەروەردەییەکان.
- دەبێ خۆیان لە هزری تاکڕەوی و خۆسەپاندن بپارێزن.
- دەبێ کێشەکانیان لە ڕێگەی گفتوگۆ و دان و ستاندنەوە چارەسەر بکەن.
- دەبێ لە کاتی سەرەدەریکردندا، ئارام و دانبەخۆداگر و لێزان بن و خۆیان لە هەڵچوون و تووڕەبوون بپارێزن.
- نابێ زوو بڕیار بدەن.
- دەبێ لەکاتی پێویستدا سەردانی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا بکەن.

## بێبەشکردنی منداڵ لە مافی ئاخاوتن

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بێبەشکردنی منداڵ لە ئاخاوتن، واتە، هەر لەسەرەتای منداڵییەوە دەمکوتی دەکەن و ناهێڵن بە ئازادی، گوزارشت لە ڕا و بۆچوونەکانی خۆی بکات و ئەوەی لە ناخی دایە بەڕاشکاوانە دەری ببڕێت.

ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هۆکاری بۆماوەیی.
- خۆسەپێنەری و تاکڕەوی دایك و باوك.
- بۆ ئەوەی وا نیشانی خەڵك بدەن کە خاوەن هەژموون و هەیبەتی خۆیانن و دەسەڵاتیان هەیە بەسەر منداڵەکانیاندا.
- بۆ ئەوەی منداڵەکانیان گوێڕایەڵیان بن و لە کۆنترۆڵیان دەرنەچن و هەردەم لە ژێردەستی ئەوان دابن.
- بۆ ئەوەی کەمترین کێشەیان بۆ دروست نەبێت.
- بۆ ئەوەی خەڵك پەسن و ستایشیان بکات و بڵێت ئەو دایك و باوکە سەرکەوتوون.

ئەڵبەتە بێبەشکردنی منداڵ لە مافی قسەکردن، زیانێکی فرە زۆر بە خودی منداڵ دەگەیەنێت، کە گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- مافەکانی منداڵ دەکەونە مەترسییەوە، بەتایبەتی مافی ئاخاوتن و پەیڤین.

- منداڵ دەبێتە کەسێکی شەرمن.
- منداڵ هەست بە خۆبەکەمزانین دەکات.
- منداڵ ناتوانێ بەرگری لە مافەکانی خۆی بکات.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز.
- منداڵ متمانە و باوەڕی بە خۆی نامێنێ و ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێت.
- کەلێنێکی زۆر دەکەوێتە نێوان منداڵ و دایك و باوکەکانی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی لاواز دەبێت.
- منداڵ لە سەرەدەری و هەڵسوکەوتەکانیدا لەگەڵ کەسانی دیکە، بەتایبەتی لەگەڵ هاوڕێیانی و مامۆستاکانی سەرکەوتوو نابێت و دووچاری کێشە و گرفت دەبێتەوە.
- منداڵ دووچاری گرێی دەروونی دەبێتەوە، چونکە ناتوانێ ئەوەی لە ناخیدا هەیە بەتاڵی بکاتەوە و دەری ببڕێت.
- خێزان و کۆمەڵگە ناتوانن بەباشی سوود لە بەهرە و تواناکانی ئەو جۆرە منداڵانە وەربگرن.
- منداڵ لە زۆر ماف بێبەش دەکرێت، چونکە ناتوانێ بەباشی بەرگری لە مافەکانی خۆی بکات.
- منداڵ لە قوتابخانە سەرکەوتوو نابێت، چونکە ناتوانێ بەشێوەیەکی کاریگەر و ئەرێنی بەشداری لە وانەکاندا بکات.
- منداڵ لە جوانبێژی و ڕەوانبێژی و زمانپاراوی بێبەش دەبێت.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە منداڵ لە مافەکانی خۆی بەهرەمەند بێت، بەتایبەتی مافی قسەکردن و بیرورا دەربڕین، دەبێ دایکان و باوکان کەش و هەوایەکی لەبار بۆ منداڵ فەراهەم بکەن و هانی بدەن گوزارشت لە ڕاوبۆچوونەکانی خۆی بکات، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە دایک و باوکەکان ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- پێویستە دایک و باوک ئاشنا بن بە مافەکانی منداڵ و دانی پێدابنێنن، لەوانەش مافی قسەکردن و بیرورا دەربڕین.
- دەبێ دایک و باوک درک بە گرنگی قسەکردنی منداڵ بکەن.
- پێویستە منداڵ بە ئازادی و بەبێ سانسۆر گوزارشت لە بۆچوونەکانی خۆی بکات.
- دەبێ دایک و باوک هانی منداڵ بدەن، بۆ ئەوەی فێرە قسەکردن و زمانپاراوی بێت.
- دەبێ دایک و باوک گشت بەربەستەکان لەبەردەم گەشەکردنی زمانی منداڵ لابەرن.
- دەبێ دایک و باوک خۆیان لە هزری خۆسەپاندن و تاکڕەوی بپارێزن.
- پێویستە منداڵ مافی پرسیارکردن وگلەیی کردن و قسەکردنی هەبێت و لە ژێر گوشار و فشار و چاوسوورکردنەوە، دەمکوت و بێدەنگ نەکرێت.

- پێویستە دایك و باوك ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- دەبێ دایك و باوك زوو زوو بڕیار نەدەن.
- گەرەکە دایك و باوك لە گشت بوارەکاندا، بەتایبەتی لە بواری ئاخاڤتندا، برەو بە گەشەپێدانی منداڵ بدەن.
- دەبێ دایك و باوك زەمینەیەکی لەبار برەخسێنن، بۆ دوورکەوتنەوەی منداڵ لە شەرمنی و گۆشەگیری و تەنیایی.
- دەبێ دایك و باوکەکان خۆیان بەدوور بگرن لە لاساییکردنەوەی کوێرانە.
- گەرەکە جاربەجار، پرس و ڕا بە کەسانی پسپۆر و شارەزا بکرێت، هەروەها ئەگەر پێویست بوو، سەردانیان بکرێت، بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێویست.

## دووركەوتنەوەی باوک یان دایک یان هەردووکیان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە ماڵەوە

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە دووركەوتنەوەیان لە ماڵەوە بۆ ماوەیەکی زۆر، جا بەهەر پاساوێك بێت، بۆ نموونە: باوکی وا هەیە بەمەبەستی بازرگانی کردن، بۆ ماوەیەکی زۆر لە هەندەران(تاراوگە)دەمێنێتەوە و تا چەندین مانگ ناگەڕێتەوە ماڵەوە، یاخود باوکی وا هەیە بە پاساوی خوێندن لە یەکێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، ڕوو لە هەندەران دەکات و بۆ چەند ساڵێك ناگەڕێتەوە، یان باوکی وا هەیە بۆ وەرگرتنی مافی پەنابەری ڕوو لە هەندەران دەکات و لە کەمپەکان دەکەوێ و بە ساڵان منداڵەکانی نابینێتەوە، یان جاری وا هەیە، دایك و باوکەکە پێکەوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە منداڵەکانیان دادەبڕێن، بۆ نموونە دایك دووچاری نەخۆشییەکی درێژخایەن دەبێت و پێویستی بەوە دەبێت لە دەرەوە بێتە چارەسەرکردن، ناچار هاوسەرەکەی لەگەڵی دەچێتە دەرەوە و منداڵەکانیان لای یەکێك لە خزمە نزیکەکانیان جێدێڵن و بۆ ماوەیەکی زۆر ناتوانن بگەڕێنەوە.

هەبوونی هەموو ئەم حاڵەتانە و هاوشێوەکانی، زیانێکی زۆر بە خودی منداڵ و دایك و باوکەکەیشی دەگەیەنێت، چونکە هەبوونی باوك یان دایك لە ماڵەوە زۆر گرنگە، بۆ ئاراستەکردن و ڕاستەڕێکردن

و ڕێنمایی کردن و ئامۆژگاریکردن و دابینکردنی پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی منداڵ.

ئەڵبەتە کە باوك یان دایك، یان هەردووکیان پێکەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لە منداڵەکانیان دابڕان، کەلێنێکی زۆر دروست دەکات و ئەم زیانانەی بەدوای خۆیدا دێنێت:

- منداڵ لە هەموو تەمەنەکاندا زۆر پێویستی بە سۆز و خۆشەویستی دایك و باوکی هەیە، بۆیە بە دوورکەوتنەوەیان، لەو سۆز و خۆشەویستییە بێبەش دەبێت و قەرەبوو ناکرێتەوە.
- منداڵ هەمیشە و لە هەموو تەمەنێکدا پێویستی بە هاوکاری و پشتیوانی و پاڵپشتی و کۆمەکی دایك و باوك هەیە، بۆیە بەدوورکەوتنەوەیان، ئەو پاڵپشتییە ماددی و مەعنەوییە لە دەست دەدات و بێناز دەکەوێت.
- بە دوورکەوتنەوەی دایك یان باوك لە منداڵ، کەلێنێك لە نێوانیاندا دروست دەبێت و زۆرجار منداڵ ئەو هەڵە دەقۆزێتەوە و واز لە قوتابخانە دێنێ، یان تووشی هاوڕێی خراپ دەبێ و کێشە بۆ خەڵك و خزم و کەس و هاوسێ دروست دەکات و دەبێتە کەسێکی لاسار و یاخی و شکستخواردوو!

- ئەگەر منداڵ بەبێ دایك یان باوك یان هەردووكیان گەورە بوو، ئەو سۆز و ڤیان و سۆزەی بۆ دایك و باوكی نامێنێ و دیوارێك لە نێوانیاندا دروست دەبێت.
- دووركەوتنەوەی دایك و باوك بۆ ماوەیەك، وا دەكات بە ئاسانی نەتوانن منداڵەكانیان بخەنەوە سەر هێڵە ڕاستەكە و ئاراستەیان بكەن و بە شێوەیەكی سەركەوتوویانە پەروەردەیان بكەن.

## چارەسەركردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان دایك و باوك، پەیوەندییەكی گەرم وگوڕ بێت و هەردوو لا بتوانن لە سەقا(كەش و هەوا)یەكی گونجاودا ڕۆڵی یەكترتەواوكەر ببینن و لە ئەركەكانیاندا سەركەوتوو بن، بەتایبەتی دایكان و باوكان، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- دەبێ دایك و باوك تا ئەوپەڕی توانا هەوڵ بدەن لە ماڵەوە دوور نەكەونەوە، بەتایبەتی بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ، چونكە هیچ كەسێك لە پەروەردە و فێركردنی منداڵەكاندا ناتوانێ ببێتە جێگرەوەیان، بۆیە هەم بۆ دایك و باوك، هەمیش بۆ منداڵ پێویستە پێكەوە بن و لەیەكتری دوورنەكەونەوە، بۆ ئەوەی هەم دایكان و باوكان ئەركی سەرشانی خۆیان جێبەجێ بكەن و نەوەیەكی

زانا و دانا و بەتوانا و وشیار و بێدار و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پێشکەوتوو و سەرکەوتوو پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن، هەم منداڵەکانیشیان لە سۆز و خۆشەویستی و توانا ماددی و مەعنەوییەکانیان بێبەش نەبن و ببنە کەسانی زانا و دانا و بەتوانا و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پشتبەخۆبەستوو و لێهاتوو و سەرکەوتوو لە گشت کایەکانی ژیاندا.

- دەبێ دایك و باوك خەمی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بخەنە پێش خەمە تایبەتەکانی خۆیانەوە و تا پێویست نەبێت، لێیان دوور نەکەونەوە.

- ئەگەر دایك یان باوك یان هەردووکیان ناچاربوون بۆ ماوەیەك لە منداڵەکانیان دووربکەونەوە، تا بکرێ باشتر وایە منداڵەکانی خۆیان لەگەڵ خۆیان ببەن، ئەگەر نەکرا، دەبێ منداڵەکانیان بە کەسێك یان کەسانێك بسپێرن کە نزیك بن لە خۆیانەوە و جێی متمانەی دایك و باوکەکە و منداڵەکانیان بن و شایانی لە ئەستۆگرتنی ئەو ئەمانەتە مەزنە بن و کەسانی خەمخۆر و دڵسۆز بن و، وەك منداڵەکانیان بە یەك چاو سەیریان بکەن.

- لە کاتی دوورکەوتنەوەی دایك و باوك لە منداڵەکانیان، دەبێ هەمیشە و ڕۆژانە لە ڕێگەی تەلەفۆن و تۆڕە

کۆمەڵایەتییەکانەوە، لە پەیوەندی بەردەوام دابن لەگەڵ منداڵەکانیان و لە سۆز و خۆشەویستی و ئامۆژگاری و ڕێنمایە پێویستەکانیان بێبەش نەکەن.

- جار بە جار دیاری و خەڵات بۆ منداڵەکانیان بنێرن، بۆ ئەوەی ببێتە هەوێنی سۆز و خۆشەویستی.
- ئەگەر بکرێت، جاربەجار سەردانی ماڵەوە بکەن، بۆ ئەوەی مەودای لێکدوورکەوتنیان نزیک بکەنەوە و ماوەیەکی زۆر نەکەوێتە نێوانیانەوە.
- پێویستە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و پتەو لە نێوان دایک و باوکی منداڵەکان و خزم و کەسوکارەکانیان هەبێت، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەکانیان دەگرنە ئەستۆ.
- پێویستە ڕۆژانە لە ڕێگەی خزم و کەسە نزیکەکانیانەوە ئاگاداری ڕەوش و حاڵی منداڵەکانیان بن، بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا هەنگاوی پێویست بنێن و بڕیاری پێویست بدەن.

### جێبەجێکردنی گشت داواکارییەکانی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە جێبەجێکردنی گشت داواکارییەکانی منداڵ، بە واتایەکی دیکە، هەر چی منداڵ فەرمان بکات. دایك و باوکی بێ سێ و دوو بۆی جێبەجێ دەکەن، ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەو جۆرە دایك و باوکانە منداڵەکانیان بەناز پەروەردە کردووە و حەز ناکەن شتێك بکەن بە دڵیان نەبێت یان دڵیان بڕەنجێت.
- پێیان وایە بەو شێوازە دەتوانن زیاتر خزمەت بە منداڵەکانیان بکەن و سەرنجیان ڕابکێشن.
- ئەو جۆرە دایك و باوکانە پارەدار و دەوڵەمەندن و پارە بەسەر منداڵەکانیاندا هەڵدەڕێژن.
- چاو لەم و لەو دەکەن.
- دڵناسك و هەستیارن.
- ڕەنگە پێشتر منداڵیان لێ مردبێت و ترسی ئەوەیان هەبێت ئەم حاڵەتە دووبارە و چەندبارە ببێتەوە.
- ئەو جۆرە دایك و باوکانە ئاشنا نین بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- ئاستی زانستی و ڕۆشنبیرییان لاوازە.
- بیر لە ئایندەی خۆیان و منداڵەکانیان ناکەنەوە، واتە کەسانی دووربین و واقعبین و وردبین نین.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك لەسەر ئەو ڕێڕەوە هەڵەیە بەردەوام بن و هەرچی منداڵەکانیان داوایان کرد، ئەوان بەبێ سێ و دوو بۆیان جێبەجێ بکەن، ئەوسا نەك هەر تەنیا منداڵەکانیان، بەڵکو خودی دایك و باوکەکە و خێزان و کۆمەڵەش دووچاری زیان دەبێت و بە زیانی هەموو لایەك تەواو دەبێت، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ تا مردن هەر چاوی لە دەستی ئەم و ئەم دەبێ و ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێت.
- منداڵ بڕوا و متمانەی بە خۆی نابێت و هەوڵدەدات لەسەر حسابی ئەوانی دیکە بژێت.
- منداڵ هیچ کارێك بە تەواوی ناباتە سەر و تاقەتی نابێت لە هیچ کارێکدا بەردەوام بێت و داهێنان بکات.
- منداڵ لە بری بەخشین، فێرە سواڵکەری دەبێت.
- منداڵ قەدری ناز و نیعمەتەکانی خوا نازانێت، چونکە بە ئاسانی دێنە بەردەستی!
- دایك و باوکەکان ناتوانن سوود لە بەهرە و توانای منداڵەکەنیان وەرگرن.
- هەمیشە منداڵ بۆ دایك و باوکی دەبێتە بارگرانی و زۆرجاریش دەبێتە کێشە و گرفت و سەرئێشە!
- هاوسەنگی ناو خێزان تێکدەچێ و بەرەو هەڵدێر دەچێت.
- کۆمەڵگە بە بوونی ئەم جۆرە کەسانە زەرەرمەند دەبێت، چونکە لە هەموو تەمەنەکان و لە هەموو شوێنێکدا دەبن بە کێشە نەك چارەسەر.

- حەزەکانی منداڵ تێر نابن و هەرچی بۆی دابین بکرێت، ئەو زیاتر دەخوازێ و زێدەتر داوا دەکات و فشارێکی زیاتر دەخاتە سەر دایك و باوکی.
- ئەو جۆرە منداڵانە لە ئەرك و کار و ژیانی خۆیاندا سەرکەوتوو نابن و هەمیشە بەرەو ڕووی کێشە و ئاستەنگەکان دەبنەوە.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

جێبەجێکردنی گشت داواکارییە ورد و درشتەکانی منداڵ، لەلایەن دایك و باوکییەوە، هاوسەنگی ژیان تێکدەدات و منداڵ بەشێوەیەك بار دێنێت، کە نەتوانێ لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێ و پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێ.

جا بۆ ئەوەی زیان لە نیوە بگەڕێتەوە و هەم دایك و باوکەکان، هەمیش منداڵ دووچاری زیانی زیاتر نەبێت، پێویست دایك و باوکەکان دەست لەو کارە هەڵگرن و لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیاندا، نە هێندە نەرم بن کە قوت بدرێن، نەهێندە ڕەقیش بن کە بشکێن!

بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- پێویستە دایك و باوك لە هەموو کارێکدا میانڕەو بن و خۆیان لە زێدەڕوویی کردن بپارێزن.
- پێویستە بزانن چ داواکارییەکی منداڵ ڕەوایە، چ داواکارییەکیشی ناڕەوایە، بۆ ئەوەی داوا ڕەواکانی جێبەجێ بکەن و داوا ناڕەواکانیشی فەرامۆش کەن.

- دەبێ دایك و باوك لە ڕێگەی دان و ستاندنەوە، منداڵەکانیان تێبگەیەنن کە سروشتی ژیان ئاوایە، ناکرێ هەموو شتێك بە دڵی مرۆڤ بێت و هەر داواکارییەکی مرۆڤ هەیبوو، جێبەجێ بکرێت، چونکە ئەمە ئەستەم و مەحاڵە، ئەگەر بشکرێ تا سەر بەردەوام نابێت.
- دەبێ دایك و باوك هەست بەو مەترسییە بکەن کە جێبەجێکردنی گشت داواکارییەکانی منداڵ،چ زیانێکی دەبێ و چ کارەساتێك بەدوای خۆیدا دێنێت.
- دەبێ دایك و باوك خۆیان لە بەنازپەروەردەکردنی منداڵ بپارێزن، تەنانەت ئەگەر تاقانەش بێت، چونکە زیانی زۆرترە لە قازانجی.
- لە ڕێگەی پرس و ڕا و بە حیکمەت و لێزانی و بە لێکتێگەیشتن بڕیار بدەن و نەکەونە ژێر کاریگەری ئەم و ئەو.
- خۆیان لە چاولێکەری کوێرانە بپارێزن.
- خۆیان ئاشنا بکەن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- لە کاتی پێویستدا، سەردانی کەسانی شارەزا و پسپۆر بکەن.
- پێویستە ئاشنا بن بە مافەکانی منداڵ و پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی، بۆ ئەوەی لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ماف و پێداویستییانە هەنگاو بنێنن.

## سپاردنی منداڵ بە قوتابخانە

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە سپاردنی منداڵ بە قوتابخانە، بە واتایەکی دیکە، هەندێ دایك و باوك لە ١٠٠% پشت بە قوتابخانە دەبەستن و پێیان وایە پەروەردە و فێرکردنی منداڵ ئەرکی قوتابخانەیە، نەك خۆیان، ئەمەش هەڵەیەکی زۆر کوشندەیە، چونکە منداڵ چوار کاتژمێر لە قوتابخانەیە، ٢٠ کاتژمێر لە ماڵەوەیە و لەبەردەستی ئەوان دایە، واتە، منداڵ چوار بەرامبەر زیاتر لە ماڵەوەیە لە قوتابخانە، بۆیە ئەرکی دایك و باوك چوار بەرامبەر زیاترە، بە بەراورد بە ئەرکی قوتابخانە و مامۆستایان.

سپاردنی منداڵ بە قوتابخانە، بۆ چەند هۆکارێکی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- لاوازی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- بێباکی و خەمساردی.
- ئاشنا نەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- بێبایەخی خوێندن و فێربوون لای ئەو جۆرە دایك و باوکانە.
- سەرقاڵی و فرە کاری دایك و باوك.
- لاوازی پەیوەندی نێوان قوتابانە و ماڵەوە.
- فرە منداڵی و هەبوونی ژمارەیەکی زۆری منداڵ.
- فەرامۆشکردنی منداڵ و پشتگوێخستنی.

- باوەڕنەبوون بە منداڵ، کە لە قوتابخانە سەرکەوتوو بێت و بتوانێ لە ئایندەدا نمرەیەکی بەرز بەدەستبێنێت.
- خۆشباوەڕی و لاساییکردنەوەی خەڵکانی دیکە.

ئەڵبەتە ئەگەر دایک و باوک پشت لە منداڵ بکەن لە قوتابخانە و بەتەنیا جێبێڵن، بێگومان چارەنووسێکی ڕەش چاوەڕێی منداڵ دەکات و ڕووبەڕووی کێشە وگرفتێکی زۆر دەبێتە و دەبێتە یەکەم قوربانی ئەو هەڵە کوشندەیە، ئینجا دایک و باوک و خێزان و کۆمەڵگەش تووشی زیان دەبن، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ لە ئەرکی خوێندن و فێربووندا سەرکەوتوو نابێت.
- منداڵ دووچاری خەمساردی و بێباکی دەبێت و ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ ناکەت.
- منداڵ هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات.
- منداڵ خۆی لە قوتابخانە دەدزێتەوە.
- منداڵ فێڵ لە ماڵەوە و مامۆستا دەکات.
- منداڵ هەست بە بێ پشت و پەنایی دەکات.
- منداڵ لە توانا و بەهرەکانی ماڵەوە بێبەش دەبێت.
- منداڵ حەزی لە خوێندن نامێنێت و چاو لەو کەسانە دەکات کە وازیان لە خوێندن هێناوە.
- ئەرک و ماندووبوونی دایک و باوک بە هەدەر دەڕوات.
- دایک و باوک و خێزان و کۆمەڵگە بە گشتی لە توانا و بەرهەکانی ئەم جۆرە منداڵانە بێبەش دەبن.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

ئەگەر دایك و باوك گەرەکیان بێت منداڵەکانیان لە خوێندن و فێربوون بەردەوام بن و لە قوتابخانە سەرکەوتوو بن، دەبێ هاوشانی قوتابخانە، ئەو بەرپرسیارەتە بگرنە ئەستۆ و ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- پێویستە دایك و باوك زۆر دڵسۆزانە و خەمخۆرانە، هەر لە سەرەتاوە مشۆری منداڵەکانیان بخۆن و بە ئەرکی سەرشانیان هەڵبستن.
- دەبێ دایك و باوك خۆ بە بەرپرسیار بزانن لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان.
- دەبێ دایك و باوك ئەو ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە بزانن، کەوا پەروەردە و فێرکردنی منداڵ، تەنیا ئەرکی قوتابخانە نییە، بەڵکو ئەرکی ماڵ و قوتابخانەیە، بەڵام زیاتر ئەرکی ماڵەوەیە، چونکە منداڵ ماوەیەکی زیاتر لە ماڵەوە بەسەر دەبات و دەمێنێتەوە.
- دەبێ پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و پتەو لە نێوان ماڵەوە و قوتابخانە هەبێت و دایك و باوك بە شێوەیەکی بەردەوام لە پەیوەندیدا بن لەگەڵ قوتابخانە.
- دەبێ دایك و باوك ئاگاداری کێشەکانی منداڵەکانیان بن، جا چ لە ماڵەوە بێت یان لە قوتاباخانە.
- دەبێ دایك و باوك زۆر بە دڵسۆزانە کێشە و گرفتەکانی منداڵەکانیان چارەسەر بکەن، جا چ لە ماڵەوە بێت یاخود لە قوتابخانە.

- دەبێ دایك و باوك دۆست و هاوڕێ بن لەگەڵ منداڵەكانیان، بۆ ئەوەی كلیلی نهێنییەكانی خۆیان بدەنە دەست ئەوان.
- پێویستە دایك و باوك ڕۆژانە بەدواداچوون و چاودێری منداڵەكانیان بكەن، لە كاتی ڕۆیشتنیان بۆ قوتابخانە و گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە، نەبادا لە گەڕانەوەیان، بچنە هەندێ شوێنی نەگونجاو، وەك كازینۆ و كافتریا و كۆڵان و شەقام و پاركەكان.
- دەبێ دایك و باوك بزانن منداڵەكانیان چ دۆست و هاوڕێیەكیان هەیە، بۆ ئەوەی لە هاوڕێی خراپ دووربكەونەوە و ببن بە هاوڕێی كەسانی دڵسۆز و خەمخۆر و ڕەوشتبەرز و دەستپاك و دڵپاك و زمانپاك.
- دەبێ دایك و باوك هەمیشە لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە شینی و شادیدا، لە هەبوونی و نەبوونیدا، پشت و پەنای منداڵەكانیان بن و هانیان بدەن بۆ خوێندن و فێربوون و كۆششكردن.

## ڕێگەدان بە منداڵ بۆ ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە دەرەوە بمێنێتەوە

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە ڕێگەدان بە منداڵ، بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە دەرەوە بمێنێتەوە، بە واتایەکی دیکە، هەندێ لە دایکان و باوکان چ بە مەبەست بێت، یان بێ مەبەست، چ بە زانین بێت، یان بە نەزانین، ئازادییەکی ڕەها و بێ قەید و مەرج بە منداڵەکانیان دەدەن، بۆ ئەوەی بە حەزی خۆیان بچنە دەروە و تا درەنگانی شەو لە کۆچە و کۆڵانەکان بسووڕێنەوە، ئەمەش بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- بێباکی و کەمتەرخەمی و خەمساردی.
- ناوشیاری و بێئاگابوون لە ئەرکی خۆیان.
- ئاشنا نەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- بەناپەروەردەکردنی منداڵەکانیان.
- فرە منداڵی و هەبوونی ژمارەیەکی زۆری منداڵ.
- چاولێکەری.
- نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری.
- فرەکاری و سەرقاڵی.
- دووری دایک و باوک لە ماڵەوە.

ئەڵبەتە ڕێگەدانی دایک و باوک بە منداڵ، بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی بێچێتە دەرەوە و بە ئارەزووی خۆی بگەڕێتەوە ماڵەوە، نەک هەر

تـەنیا زیـانی بـۆ منـداڵ دەبێـت، بـەڵکو دایـك و بـاوك و خێـزان و کۆمەڵگەش باجەکەی دەدەن، کە دەتوانین ئەو زیانانە لە چەند خاڵێکدا چڕکەینەوە:

- منداڵ دووچاری سەرکێشی و لاساری دەبێت.
- منداڵ تووشی هاوڕێی خراپ دەبێت و پەنا بۆ کـاری نابەجێ و ناشیاو دەبات، وەك جگەرەکێشان و قومـار و مـاددە هۆشبەرەکان و دزی و قۆڵبڕی و ڕێگری و جەردەیی و...تاد.
- منداڵ ڕووبەڕووی کێشە و گرفتێکی زۆر دەبێتەوە.
- لە ژێر دەسەڵاتی دایك و باوك دەردەچێت و دەبێتە کەسێکی کەللە ڕەق و گوێنەبیس و فەرمان شکێن.
- چاو لە کەسانی سەرسەری و شەلاتی و خۆڕی دەکات.
- دەبێتـە هـۆی ئـەوەی لـە خوێنـدن داببڕێـت و واز لـە خوێنـدن و قوتابخانە بهێنێت.
- لە ئەرك و کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.
- فێڵ لە دایك و باوکی دەکات.
- فێرە درۆ دەبێت و هەوڵدەدات دەستخەڕۆ و چەواشەیان بکات.
- ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- دووچاری ڕووداوی نەخوازراو دەبێ.
- لە ژیاندا دەبێتە کەسێکی شکستخواردوو و دۆڕاو.
- دایك و باوکی ئەو جۆرە منداڵانە ڕووبەڕووی کێشـەی کۆمـەڵایـەتی دەبن لەگەڵ خەڵکیدا.

- دایك و باوكی ئەو جۆرە منداڵانە، ناتوانن منداڵەكانیان كۆنترۆڵ بكەن.
- دایـك و بـاوكی ئـەو جـۆرە منداڵانـە نـاتوانن سـوود لـە توانـا و بەهرەكانیان وەربگرن.
- هـەم خێـزان، هـەمیش كۆمەڵگـە بەدەسـت ئـەو جـۆرە منداڵانـە دەناڵێنن.
- كێشەی خێزانی و كۆمەڵایەتی زۆر دەبێت.
- خێزان و كۆمەڵگە ناتوانن وەك پێویست سوود لە بەهرە و تواناكانی ئەو جۆرە منداڵانە وەربگرن.
- دایـك و بـاوك و منداڵەكانیان، لـە ئاینـدەدا تووشی كێشـە و گرفـت دەبـن و نـاكۆكی و دووبـەرەكی دەكەوێتـە نێوانیـان و چارەسـەرەكە ئەستەم دەبێت.

## چارەسەركردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی نە منداڵ لە دەرەوە خۆی بدۆڕێنێت و دووچاری كێشـە و گرفـت و هـاوڕێی خـراپ و دەرد و چەرمەسـەری ببێـت، نـە دایـك و بـاوكی ئـەو جـۆرە منداڵانـە و كۆمەڵگـەش ڕووبـەڕووی كێشـە ببنـەوە، پێویسـتە لەسـەر دایـك و بـاوك و سەرپەرشـتیاران، لـە كـاتی پـەروەردە و فێركردنی منداڵەكانیان، ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- زۆر بـە هەسـتیاری و بەرپرسـیارانە سـەرەدەری لەگـەڵ منداڵەكانیان بكەن.
- بەهیچ شێوەیەك لێیان غافل نەبن.

- پێویستە لەسەر دایکان و باوکان ئاگاداری منداڵەکانیان بن، بەتایبەتی لە کاتی چوونە دەرەوە و گەڕانەوەدا، ئاخۆ لەگەڵ کێ چوونەتە دەرەوە، بۆ کوێ ڕۆیشتوون، خەریکی چی بوون و کەی دەگەڕێنەوە؟
- پێویستە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و پتەو لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکان هەبێت، لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی و ڕێزگرتنی یەکتری.
- پێویستە دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکانیان دۆست و هاوڕێ بن، بۆ ئەوەی منداڵەکانیان نهێنی خۆیان پێی بڵێن.
- پێویستە لە سەرەدەریکردندا نە زۆر شل بن، کە منداڵەکانیان ڕەها بکەن، نە هێندە ڕەقیش بن کە منداڵەکانیان حەپس بکەن.
- پێویستە ئەرك و بەرپرسیارەتی خۆیان بزانن و جێبەجێی بکەن.
- نابێ چاولێکەر بن و چاو لەم و لەو بکەن.
- نابێ بە پاساوی کار یان هەر شتێکی دیکە، خۆیان لە چاودێری و بەدواداچوونی منداڵەکانیان بدزنەوە.
- دەبێ بەبەردەوامی و لە ڕێگەی دان و ستاندن و گفتوگۆکانەوە باس لە کێشە و چارەسەرەکان بکرێت و بەهیچ شێوەیەك پەنا نەبرێتە بەر توندوتیژی و شەڕەنگێزی و تەرقیکردنەوە.

## ستایش نەکردنی منداڵ لە کاتی ئەنجامدانی کاری چاکە

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە ستایش نەکردنی منداڵ لە کاتی ئەنجامدانی کاری چاکە. واتە، هەندێ دایک و باوک چ بە مەبەست یان بێ مەبەست، ستایشی منداڵەکانیان ناکەن لەسەر ئەو کارە چاکانەی کە ئەنجامی دەدەن، ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ناوشیاری و بێئاگایی ئەو جۆرە دایك و باوکانە.
- نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری ئەو جۆرە دایك و باوکانە.
- درك نەکردنی دایك و باوك بەو ڕاستییە کە ستایشکردنی منداڵ لەسەر ئەنجامدانی کاری چاك و باش ئەرك و بەرپرسیارەتییە.
- ئاشنانەبوونی ئەو جۆرە دایك و باوکانە بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- هەژاری و نەداری.
- فرە کاری و سەرقاڵی.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- بێباکی و خەمساردی.
- نەشارەزایی.
- لەبارنەبوونی ژینگەیەکی گونجاو.

بێگومان ئەگەر دایك و باوکەکان لە کات و ساتی خۆیدا ستایشی منداڵ نەکەن لەسەر ئەنجامدانی کاری چاکە، نەك هەر تەنیا منداڵ،

بگرە دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگەش لەم هەڵەیە زەرەرمەند دەبن و باجەکەی دەدەن، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ تاسەر لەسەر ئەنجامدانی کاری چاك و شایستە بەردەوام نابێت.
- منداڵ هەست دەکات کەس قەدری کارەکەی نازانێت.
- منداڵ پەیتا پەیتا بەرەو تەمبەڵی و تەوەزەلی و خەمساردی و بێباکی دەچێت.
- هێز و وزەی کارکردن لە ناخی منداڵ کز و لاواز دەبێت.
- دوور نییە ڕوو لە ئەنجامدانی کاری نابەجێ بکات، بۆ ئەوەی سەرنجی دایك و باوك و خزم و کەسوکارەکانی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت.
- ناتوانێ بەرەو داهێنان و ئەفراندن هەنگاو بنێت.
- ئەرك و کارەکانی بە سستی ئەنجام دەدات.
- لە ژیاندا بێ ئومێد دەبێت و ڕووبەڕووی کێشە وگرفت دەبێتەوە.
- هەم دایك و باوکی منداڵەکان، هەمیش خێزان و کۆمەڵگە لە بەهرە و تواناکانی ئەو جۆرە منداڵانە بێبەش دەبن.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ بەردەوام بێت لەسەر ئەنجامدانی کاری چاکە و لە ئەرکەکانیدا ساردنەبێتەوە، پێویستە لەسەر دایك و باوکەکانی، ئەم هەنگاوە گرنگانە بهاوێژن:

- پێویستە دایك و باوکی منداڵ ئەو ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە بزانن کە ستایشکردنی منداڵ لەکاتی پێویست، نەك هەر باشە، بەڵکو پێویستیشە و دەبێ ستایش بکرێت، بۆ ئەوەی زیاتر هانبدرێت بۆ ئەنجامدانی کار و کۆششی زیاتر و بەرهەمدارتر.
- دەبێ دایك و باوك بزانن چ کاتێك پێویستە ستایشی منداڵ بکرێت و چ کاتێکیش پێویست نییە، یاخود زیانی هەیە!
- دەبێ ستایشی دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان لە دڵەوە هەڵقوولا بێت، تاکو زیاتر کاریگەری لەسەر دڵ و دەروونی منداڵ جێبێڵێت.
- دەبێ ستایشکردنی منداڵ لە کات و ساتی خۆیدا بێت و دوانەخرێت بۆ کاتێکی دیکە.
- پێویستە دایك و باوك بە شێوەیەکی کردەیی ستایشکردن لە ژیانی خۆیاندا بەرجەستە بکەن، بۆ ئەوەی منداڵ فێرە ئەو وانەیە گرنگە ببێت.
- دەبێ دایك و باوکەکان، ستایشکردنی منداڵەکانیان بەگرنگ بزانن، بەتایبەتی لەو کاتەی کە منداڵ کارێکی چاکە ئەنجام دەدات، پێویستی بە ستایش کردنە، هەروەها ستایشی کارە چاکەکانیشی بکرێت، بۆ ئەوەی ڕژد بێت لەسەر ئەو کارە چاکانە.
- دەبێ دایك و باوك ستایش وەك هۆکارێکی پەروەردە و فێرکردن بەکاربهێنن.
- پێویستە جاربەجار هاوشانی ستایش، دیاری و خەڵاتیش بە منداڵ بدرێت، بۆ ئەوەی هەست بکات کە کەسانێك هەن ڕێز لە کارە چاکەکانی دەگرن و بەرز دەینرخێنن.

- دەبێ دایك و باوك لە كاتی پێویست سەردانی كەسانی پسپۆر و شارەزا بكەن، بۆ ئەوەی بزانن و بتوانن بە شێوەیەكی زانستیتر و بابەتیتر و پەروەردەییتر سەرەدەری لەگەڵ منداڵەكانیان بكەن.
- دەبێ منداڵ هەر تەنیا لەو كاتە ستایشی نەكرێت، كە كاری چاكە ئەنجام دەدات، بەڵكو پێش ئەنجامدانی كارێكی چاوەڕوانكراویش ستایش بكرێت، كە شایانی ستایشكردن بێت.

بۆ نموونە لەبارەی میوانەوە: دەبێ جار بەجار دایك و باوك بە منداڵ بڵێن: میوان زۆر خۆشەویستە، بۆیە كاتێ میوانێكمان بۆ دێت، ئەگەر بەجوانی پێشوازیی لێ بكەیت و قەدری بگریت و خزمەتی بكەیت، هەم لای خۆمان، هەمیش لای میوانەكەمان خۆشەویست و ڕێزلێگیراو و ستایشكراو دەبێت.

یان دایك و باوك بە منداڵ بڵێن: پەڕاندنەوەی نابینا لە شەقام، خێر و پاداشتێكی زۆری هەیە و هەركەسێك ئەو كارە بكات، هەم لە دونیا دەبێتە خۆشەویستی خەڵك، هەمیش لە قیامەت ڕەزامەندی خودای مەزن بەدەستدەهێنێت!

- پێویستە دایك و باوك زیاتر جەخت لەسەر دەستكەوتەكان بكەنەوە، نەك كەسایەتی منداڵ.
- پێویستە لەسەر كاری چاكە، ستایشی منداڵ بكرێت، هەرچەند كارەكە كەمیش بێت، چونكە دەبێتە هۆی ئەوەی كە منداڵ ڕۆژ بە ڕۆژ پەرە بەكاری چاكە بدات و لەسەری بەردەوام بێت.

- کاتێ دایك و باوك، ستایشی منداڵ دەکەن، منداڵ هەست بەوە دەکات، کە کەسێکی ڕێزلێگراو و پەسەندکراو و سوپاسکراو و گرنگیپێدراوە.
- پێویستە دایك و باوکەکان بۆ ستایشکردنی منداڵەکانیان، ئەو وشەگەلانە بەکاربهێنن،کە منداڵەکانیان حەزیان لێیە و پێی دڵخۆشن.
- منداڵ بە ستایشکردنی، فێر دەبێت ڕێز لە کار و چاکەی خەڵکانی دیکە بگرێت و ستایشی ڕۆڵیان بکات.

## گۆشەگیرکردنی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە، لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە گۆشەگیرکردنی منداڵ لە ماڵەوە، بەواتایەکی دیکە، هەندێ لە دایکان و باوکان بەپاساوی ئەوەی منداڵەکانیان لە خراپەی خراپەکاران پارێزراو بن و ڕووبەڕووی مەترسی ئەم و ئەو نەبنەوە و دووچاری ڕووداوی نەخوازراو نەبن و تووشی هاوڕێی خراپ نەبن و لە ساخ و سلامەتییان دڵنیا بن، هەوڵدەدەن لە ماڵەوە حەپسیان بکەن، هەروەها زۆر کەم ڕێگەیان پێدەدەن کە بچنە دەرەوە لەگەڵ دۆست و هاوڕێیانیان پیاسە بکەن و بچنە گەشت و گوزار و گەمە و یاری و ....تاد.

ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- دڕندۆنگی و وەسواسی ئەو جۆرە دایك و باوکانە.
- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری ئەو جۆرە دایك و باوکە.
- چاولێکەری و کاریگەری ژینگە و دەوروبەر لەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان.
- هەبوونی ئەزموونێکی تاڵ، بۆ نموونە: ڕەنگە منداڵانی ئەو دایك و باوکانە، پێشتر دووچاری ڕووداوی نەخوازراو ببن، بۆیە دایك و باوکەکانیان نایانەوێ ئەو جۆرە حاڵەتانە دووبارە و چەندبارە ببنەوە.
- ترس لە چاوپیس و چاوچنۆکەکان.
- بەنازپەروەردەکردنی منداڵەکانیان.
- گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دایك و باوك لە کۆمەڵگە.
- هەست کردن بە ترس و دڵەڕاوکێ و نیگەرانی.

- کاریگەری ڕووداوەکانی دەوروبەر لەسەر هەست و سۆزی ئەو جۆرە دایك و باوکانە.
- هەست ناسکی دایك و باوك.
- هەندێ جار تاقانەبوونی منداڵ، وا دەکات کە دایك و باوکەکان ترسیان هەبێت لەوەی بەلایەکی بەسەر بێت، بۆیە پەنا بۆ گۆشەگیرکردنی دەبەن و حەزناکەن لێیان دوورکەوێتەوە.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك ڕژد بن لەسەر گۆشەگیرکردن و حەپسکردنی منداڵ لە ماڵەوە و مافی چوونەدەرەوە و یاریکردن و گەشتکردن و پیاسەکردن و...تاد نەبێت، ڕووبەڕووی کێشە و گرفتێکی زۆر دەبێتەوە و ئەو کێشە و گرفتانە کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر خێزان و کۆمەڵگەش جێدێڵێت،گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ بە گۆشەگیری و دوورەپەرێزی گەورە دەبێت و کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر گەشەی ئەو جێدێڵێت، بەتایبەتی گەشەی هزری و زانستی و دەروونی و کۆمەڵایەتی.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی شەرمن.
- بڕوا و متمانەی بە خۆی نابێت.
- هەست بە خۆکەمزانین دەکات.
- ناتوانێ سوود لە توانا و بەهرەکانی خۆی وەربگرێت.
- لە ئەرك و کارەکانیدا سەرەکەوتوو نابێت.
- ناتوانێ خۆی لەگەڵ هەڤاڵانی و خەڵکیدا بگونجێنێت.
- دەبێتە کەسێکی تووڕە و زوو زوو هەڵدەچێ!
- ناتوانێ کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات.

- له هەڤاڵانی دوادەکەوێت.
- له پەیڤیندا زمانپاراو و ڕەوان نابێت.
- تووشی نەخۆشی دەروونی و خەمۆکی دەبێت.
- منداڵ بەئاسانی نابێتە کەسێکی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانی ئەو هەر لە منداڵی، تا تەمەنی پیری، لەگەڵ خەڵکیدا لاواز دەبن.
- کەسێکی دووربین و واقعبین و وردبین نابێ و ناتوانێ بە جوانی واقع بخوێنێتەوە.
- دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگە بەگشتی، وەك پێویست سوود لە توانا و بەهرەکانی وەرناگرن و لە وزەیەکی زۆر بێبەش دەبن.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانیدا بەشێوەیەکی سروشتی و تەندروست گەشە بکات و دوور بێت لە دوورەپەرێزی و گۆشەگیری و تەنیایی، پێویستە دایکان و باوکان ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- پێویستە دایك و باوك بەهەر پاساوێك بێت، دەستبەرداری بیرۆکەی گۆشەگیرکردنی منداڵەکانیان بن، چونکە کارێکی ناڕاست و هەڵەیە.
- پێویستە دایك و باوك نە هێندە توند بن، کە نەهێڵن منداڵەکانیان لە ماڵ بچنە دەرەوە، نەهێندەش سست بن، کە هیچ جۆرە

چاودێرییەکیان بەسەریانەوە نەبێت کاتێ دەچنە دەرەوە، بەڵکو باشتر وایە مامناوەندی بن، بۆ ئەوەی نە شیش بسووتێت، نە کەباب!

- پێویست دایك و باوك لە ئاستێکی بەرزی زانستی و ڕۆشنبیری بەهرەمەند بن، بۆ ئەوەی بتوانن سەرەدەری لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتەکان بکەن
- پێویستە دایك و باوك هانی منداڵەکانیان بدەن بۆ یاریکردن و سەردارنکردنی ماڵی هاوڕێکانیان، بەڵام هاوشانی ئەمە، دەبێ لەکاتی پێویستدا ڕێنمایی و ئامۆژگاری بکرێن، بۆ ئەوەی نەکەونە هەڵە و تەڵەوە...
- دەبێ دایك و باوك ڕۆڵیان هەبێت لە هەڵبژاردنی هاوڕێی چاك و ڕەوشتبەرز و هیممەتبەرز و کۆششکار بۆ منداڵەکانیان، بۆ ئەوەی نەکەونە داو و تەڵەی هاوڕێی خراپ.
- ئەرکی دایك و باوکەکانە ژینگەیەکی لەبار بۆ منداڵەکانیان فەراهەم بکەن، بۆ ئەوەی تێدا ئاسوودە بن و لە ناخەوە هەست بە دڵخۆشی و ئاسوودەیی بکەن.
- کاتێ دایك و باوك ڕێگری دەکەن لە چوونەدەرەوەی منداڵەکانیان، پێویستە لە ڕێگەی بەڵگەهێنانەوە، قەناعەت بە منداڵەکانیان بکەن، کە مانەوەیان لە ماڵەوە لە وەها حاڵەتێکدا چاکترە لە چوونەدەرەوەیان، لەبەر ئەم هۆکارانە: یەك و دوو و سێ و...تاد!
- پێویستە هەمیشە دایك و باوك و منداڵەکانیان لە ڕێگەی دان و ستاندن و گفتوگۆوە کێشە و گرفتەکانیان چارەسەر بکەن و پەنا بۆ هیچ جۆرە توندوتیژییەك نەبەن.

- پێویستە دایك و باوك و منداڵەكان ڕێز لە یەكتری بگرن و خۆیان لە كاری هەڵەشەیی بپارێزن.
- پێویستە دایك و باوكەكان خۆیان لە چاولێكەری و لاساییكردنەوە بپارێزن.
- پێویستە دایك و باوكەكان خۆیان لە نازاندنی منداڵەكانیان بەدوور بگرن.

## بەرتیلدان بە منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بەرتیڵدان بە منداڵ، واتە، ئەو جۆرە دایك و باوکانە، کاتێ هەندێ لە کارەکانی ماڵەوە، یان بازاڕ بە منداڵ دەسپێرن، پارە و بەرتیڵی پێدەدەن و پێی دەڵێن: ئەگەر ئەو کارەمان بۆ بکەیت، ئەوا ئەوە و ئەوەت دەدەینێ، بەمەش منداڵ فێرە بەرتیل وەرگرتن دەبێت و لە ئایندەدا هەر کارێکی پێ بسپێرن، داوای پارە و ئیمیازات لە دایك و باوکی دەکات!!!

ئەم هەڵەیەی دایك و باوکیش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری.
- هەست نەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- بێباکی و خەمساردی.
- شارەزانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان
- چاولێکەری و لاسایی کردنەوەی خەڵکانی دیکە.
- نازاندنی منداڵ.
- ڕانەهێنانی منداڵ لەسەر وەرگرتنی بەرپرسیارەتی.
- ئاشنانەکردنی منداڵ بە ئەرك و کارەکانی.
- هان نەدانی منداڵ بۆ ئەنجامدانی کارەکان بەبێ بەرامبەر.
- نەبوونی توانای کۆنترۆڵکردن و ئاراستەکردنی منداڵ بەشێوەیەکی تەندروست.
- ئەو جۆرە دایك و باوکە زیاد لەپێویست دڵنەرم و بەسۆزو دلۆڤانن.

- بیر لە ئایندەی منداڵەکانیان ناکەنەوە.

ئەڵبەتە ئەگەر دایک و باوک هەر سوور و ڕژد بن لەسەر ئەم هەڵەیە و هەر لە منداڵییەوە منداڵەکانیان فێرە بەرتیلخۆری بکەن و بۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی گەورە یان بچووک، کەم یان زۆر، بەرتیلێکی پێ بدەن، زیانێکی زێدە زۆر لە خودی منداڵەکە و دایک و باوکی و خێزان و کۆمەڵگەش دەگەیەنێت، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵ هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات.
- منداڵ بەشێوەیەکی ناتەندروست پەروەردە دەبێت.
- باری شانی دایک و باوکەکە قورس دەبێت.
- منداڵ کە گەورەبوو، بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک، چاوی لەوە دەبێت لە بەرامبەردا بەرتیلێک وەربگرێت.
- ئەم کارە دەبێتە نەریتێکی باو و ناپەسەند لە ناو کۆمەڵگەدا.
- ئەندامانی دیکەی خێزان فێرە هەمان کاری ناپەسەند دەبن.
- هۆکارێکە بۆ بڵاوبوونەوەی پەتای بەرتیلدان و بەرتیلخۆری.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایک و باوک دووچاری ئەم هەڵەیە نەبن و بەرتیل بە منداڵەکانیان نەدەن و لەو کارە ناپەسەندە دوورکەونەوە، دەبێ ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- پێویستە ئاشنا بن بە ئەرك و کارەکانیان.
- گەرەکە هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن.
- دەبێ ئاشنا بن بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.

- دەبێ ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان و بەشێوەیەکی زانستییانە و پەروەردەیانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- هاوسەنگی نێوان و ئەرك و مافەکاندا بپارێزن.
- لە قۆناغە جیاجیاکاندا، بەپێی ئەو توانا و هێزەی کە منداڵەکانیان هەیانە، ئەرك و بەرپرسیارەتییان پێ ببەخشن.
- نابێ هەمبەر هەر کارێك کە منداڵ ئەنجامی دەدات، بێتە پاداشت و خەڵاتکردن، چونکە فێرە بەرتیلخۆری دەبێت و کە گەورە بوو، بەئاسانی واز لەو خووە ناپەسەندە ناهێنێ.
- پێویستە هەماهەنگی و پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان دایك و باوکەکاندا هەبێت.
- دەبێ دایك و باوك خۆیان لە هەڵوێست و کاری هاودژ بپارێزن، بەتایبەتی لە حزوری منداڵەکانیاندا.
- دەبێ دایك و باوك هەر لەسەرەتاوە منداڵ لەسەر ئەوە ڕابێنن کە ببێتە کەسێکی ئەرکپارێز و بەرپرسیارەتی وەرگر و هەست بە بەرپرسیارەتی بکات.
- دەبێ خۆیان لە بەنازپەروەردەکردنی منداڵ بپارێزن.
- دەبێ بە ئەندازە پارە بە منداڵ بدرێت، واتە، نەهێندە زۆر پارە بەسەریدا هەڵبرێژن، کە بەلاڕێدا بڕوات و ببێتە کەسێکی سەرەڕۆ، نە هێندەش کەم بێت، کە دەستی لە چاوی ئەم و ئەو بێت و هەست بە زەلیلی بکات، یان پەنا بۆ دزیکردن ببات.
- دەبێ دایك و باوك خۆیان لە چاولێکەری کوێرانە بەدوور بگرن.

## زیاد وابەستەکردنی منداڵ بە خۆیانەوە

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە زیاد وابەستەکردنی منداڵ بەخۆیانەوە، واتە، دایك و باوکەکان، لە شینی و شادییەکان و خۆشی و نەخۆشییەکان، بۆ هەر شوێنێ بچن، منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبەن و بەخۆیانەوە دەچەسپێنن، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- خۆشویستی منداڵ زیاد لە حەددی خۆی.
- نازاندنی منداڵ.
- ترسان لە چارەنووسی منداڵ.
- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- هەبوونی ژینگەیەکی ناتەندروست.
- چاولێکەری.
- هەبوونی دوودڵی و دڕدۆنگی.
- هەبوونی هەستیارییەکی زۆر.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك لەسەر ئەم هەڵەیە بەردەوام بن و زیاد لە پێویست منداڵ وابەستەی خۆیان بکەن، ئەوا منداڵ، زوو یان درەنگ باجەکەی دەدات، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ متمانەی بە تواناکانی خۆی نامێنێ.
- منداڵ بۆ کارە ورد و درشتەکانی، پەنا بۆ کەسانی دیکە دەبات.
- منداڵ هەست بەبەرپرسیارەتی ناکات.

- منداڵ وەك پێویست ناتوانێ سوود لە توانا و بەهرەکانی وەربگرێ.
- منداڵ ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێ.
- منداڵ دەبێتە بار بەسەر شانی دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگەوە.
- منداڵ بیر لە چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆی ناکاتەوە و هەمیشە چاوی لەوەیە کەسانی دیکە کێشەکانی بۆ چارەسەر بکەن.
- منداڵ لەو ئەرك و کارانەدا سەرکەوتوو نابێت کە پێی دەسپێردرێن و خۆی لێ دەدزێتەوە.
- منداڵ لە ژیانیدا سەرکەوتوو نابێت و ڕووبەڕووی شکست و نەهامەتی و مەینەتی دەبێتەوە.
- منداڵ بەناز پەروەردە دەبێت.
- ناتوانێ لەگەڵ دۆست و هاوڕێکانی بگونجێ.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ وابەستە نەبێت بە دایك و باوکییەوە و لە ئایندەدا بتوانێ لەسەر قاچەکانی بوەستێ، پێویستە دایك و باوکەکان ئەم هەنگاوە گرنگانە بهاوێژن:

- پێویستە لە سەرەدەریکردندا لەگەڵ منداڵەکانیان مامناوەندی بن، واتە، نە بەناز باربهێنن، نە فەرامۆشیان بکەن.
- دەبێ دایکان و باوکان، ئەرك و بەرپرسیارەتی بە منداڵەکانیان ببەخشن.
- دەبێ هەستی باوەڕبەخۆبوون لە ناخی منداڵەکانیان بڕوێنن.
- دەبێ خۆیان لە چاولێکەری کوێرانە بپارێزن.

- دەبێ وا لە منداڵەکانیان بکە، کە پشت بە تواناکانی خۆیان ببەستن و متمانەیان بەخۆ هەبێت.
- دەبێ دایك و باوك ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- نابێ گشت داواکارییەکانی منداڵ جێبەجێ بکەن.
- دەبێ هێندە ئازادی بە منداڵ بدەن کە لەگەڵ دۆست و هاوڕێیانی یاری و وازی بکات.
- نابێ دەست لە کارە ورد و دروشتەکانی منداڵ وەربدەن.
- نابێ هێندە هەستیار و دڵناسك بن، کە زیان بە بەرژەوەندییەکانی منداڵەکانیان بگەیەنن.

## کارکردن بە منداڵ بەمەبەستی خۆدەوڵەمەندکردن

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە کارکردن بە منداڵ بەمەبەستی کۆکردنەوەی پارە و پووڵ و سەروەرت و سامان، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێکی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- چاوچنۆکی دایک و باوک.
- هەژاری و دەستکورتی دایک و باوک.
- چاولێکەری و لاسایی کردنەوەی خەڵکی دیکە.
- ئاشنا نەبوون بە مافەکانی منداڵ.
- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایک و باوک.
- بیرنەکردنەوە لە ئایندەی منداڵ.
- هەڵپەرستی و بەرژەوەندخوازی.
- خۆسەپاندن و تاکڕەوی و باڵادەستی.
- بیرتەسکی و کورتبینی.

ئەڵبەتە ئەگەر دایک و باوک، هەر لە سەرەتای منداڵییەوە، منداڵەکانیان بخەنە بەر کار و کەسابەت و ناچاریان بکەن تاکو کار بکەن، زیانێکی زۆر بە بەرژەوەندی ئەوان دەگەیەنێ و چارەنووسیان بەرەو هەڵدێر دەبات، کە خۆی لەم چەند خاڵەدا دەبینێتەوە:

- ئەم کارە پێچەوانەی جارنامەی مافی مرۆڤ و مافی منداڵە.
- منداڵ لە مافە سەرەکییەکانی بێبەش دەبێت، وەك خوێندن و گەشەکردن بەشێوەیەکی سروشتی.
- منداڵ لە میانەی کارکردن، ڕووبەڕووی توندوتیژی کەسانی لەخۆگەورەتر دەبێتەوە و زۆرجار دەستدرێژی دەکرێتە سەری.
- زۆرجار جەستەی ناسکی منداڵ بەرگەی کارکردن ناگرێ و تووشی کێشەی هەقیقی دەبێتەوە.
- لە دۆست و هاوڕێیانی دوادەکەوێ.
- بێبەش دەبێ لە یاری و دۆستان و هەڤاڵانی دادەبڕێت.
- منداڵ لە پەروەردە و فێرکردن دوور دەکەوێتەوە.
- دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگە لە توانا و بەهرە هزری و زانستییەکانی بێبەش دەبن.
- ئەم جۆرە منداڵانە زیاتر لە منداڵانی دیکە چەواشە و دەستخەڕۆ دەرکرێن.
- زۆرجار لە کۆمەڵگە دادەبڕێن و دەبنە منداڵی گۆشەگیر و دوورەپەرێز.
- ئەو جۆرە منداڵانە کە گەورە بوون، ویست و کەسایەتییەکی لاوازیان دەبێت.

- منـدالْ لـه ئاينـدەدا، هـەمان ئـەزموونی خـۆی بـۆ نـەوەكانیان دەگوازێتەوە و بەشێوەیەكی كردەیی لە ژیانی خۆیدا پڕۆڤە دەكات!

## چارەسەركردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی مندالْ لەدەست ئەم كێشەیە ڕزگاری ببێت و لە ئێستا و ئایندەدا كاریگەرییەكی نەرێنی لەسەر گشت قۆناغ و كایەكانی ژیانی دروست نەكات و لە خوێندن و فێربوون و وەرزش و بەهرەكانی دیكەی ژیان بێبەش نەبێ، پێویستە لەسەر دایك و باوك و كەسوكارەكانی، كەوا ئەم هەنگاوە گرنگانە بهاوێژن:

- دەبێ دایك و باوك، وەك مرۆڤێكی ئازاد سەیری مندالْ بكەن، نەك وەك كۆیلە!
- دەبێ دایك و باوكەكان ئەرك و بەرپرسیارەتی خۆیان بە ڕێكوپێكی و جوانی جێبەجێ بكەن.
- نـابێ دایـك و باوكـەكان، منـدالْ بـۆ كـاری نابـەجێ و ناپەسـەند بەكاربێنن.
- پێویستە مافەكانی مندالْ بپارێزن.
- دەبێ خۆیان لە چاوچنۆكی و چاوبرسییەتی بەدوور بگرن.

- نابێ لەپێناو پەیداکردن و کۆکردنەوەی پارە و پووڵ و سەروەرت و سامان و خۆدەوڵەمەندکردن، کار بە منداڵ بکەن، مەگەر کارێکی ماڵەوە بێت، ئەویش دەبێ جۆری کارەکە گونجاو بێت لەگەڵ تەمەن و ڕەگەزی منداڵەکە، بۆ ئەوەی هەست بە بەرپرسیارەتی بکات و لە ئایندەدا ببێتە کەسێکی بەرپرسیارەتی وەرگر.
- نابێ بەپاساوی هەژاری، کار بە منداڵ بکرێ یان لە خوێندن و فێربوون بێبەش بکرێت.
- نابێ بەهۆی هەبوونی فشارەوە، دایك و باوکەکان فشار بۆ سەر منداڵ دروست بکەن.
- بەپێی ماددەی یەکەمی جاڕنامەی مافەکانی منداڵ، منداڵ تا تەمەنی ١٨ساڵی، هەر بە منداڵ هەژمار دەکرێ، بۆیە دەبێ وەك منداڵ سەیر بکرێت و ناچار بە ئەنجامدانی کاری قورس نەکرێت.

## نادیدەگرتنی هەستەکانی منداڵ

منـداڵ وەك هـەر مرۆڤێکـی دیکـە، خـاوەنی هەسـت و سـۆزە، بگـرە بوونـەوەرێکی زۆر هەسـت ناسـکە! بۆیـە دەبیَ لـە دەربڕینـی هەسـت و سـۆزەکانیدا ئـازاد بێـت و لەلایـەن دایـك و بـاوکی یـان کەسـوکاری، دەمکـوت نـەکرێت یـان هەسـتەکانی فـەرامۆش نـەکرێن، مخـابن! هەڵەیـەکی دیکـە لـەو هەڵـە باوانـەی کـە هەندیَ لـە دایکـان و باوکـان ئەنجامی دەدەن، بریتییـە لـە نادیـدەگرتنی هەسـت و سـۆزەکانی منـداڵ، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- لاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- بێباکی و خەمساردی.
- لەبەرچاونەگرتنی کەسایەتی منداڵ.
- هەڵچوون و تووڕەیی.
- گرنگی نەدان بە بەهرە و تواناکانی منداڵ.
- چاولێکەری.
- ئاشنانەبوون بە فەلسەفەی پەروەردە و فێرکردن.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- نەبوونی هەماهەنگی و لێکتێگەیشتن لە نێوان دایك و باوکدا.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- نەخوێندنـەوەی منـداڵ و بەهەڵـە سـەرەدەریکردن لەگـەڵ هەسـت و سۆزەکانی.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك،بە شێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە سەرەدەری لەگەڵ هەست و سۆزەکانی منداڵ نەکەن، چەندین زیانی گەورە لێ دەکەوێتەوە، لەوانە:

- منداڵ دووچاری کۆمەڵێك گرێی دەروونی دەبێتەوە.
- هەست و سۆزەکانی منداڵ بەشێوەیەکی ئاسایی گەشە و نەشونما ناکەن.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز.
- منداڵ ناتوانێ خۆی لەگەڵ ژینگەی دەوروبەر و هاوڕێیانی بگونجێنێت.
- لە ئەرك و کارەکانیدا ڕووبەڕووی کێشەی جددی دەبێتەوە.
- لە ژیاندا کەسێکی سەرکەوتوو نابێت.
- کێشە و کەلێن و درز دەکەوێتە نێوان دایك و باوك و منداڵ.
- هەستەکانی منداڵ بریندار دەبن.
- منداڵ لە خۆشی و شادییەکان بێبەش دەبێ.
- منداڵ لە ژیانیدا دەبێتە کەسێکی هەستیار و خەمۆك، هەروەها زوو زوو هەڵدەچێت.
- منداڵ لە ئایندەدا، دووچاری گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دەبێەوە.
- کۆمەڵگە لە توانای ئەو جۆرە منداڵانە بێبەش دەبێت.

**چارسەرکردنی ئەم هەڵەیە**

ئەرکی دایکان و باوکانە ڕێز لە هەست و سۆزی منداڵەکانیان بگرن و دەرفەتی ئەوەیان پێ بدەن، کە بە شێوەیەکی ئازاد گوزارشت لە

هەست و سۆزی خۆیان بکەن، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم هەنگاوە گرنگانە بنێن:

- پێویستە دایکان و باوکان، کەشوهەوایەکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی لە ناو خێزاندا بڕەخسێنن، بۆ ئەوەی منداڵ لە دۆخێکی تەندروستدا گەشە بکات.
- پێویستە خۆ لەبەکارهێنانی هەموو جۆرە توندوتیژییەك بپارێزن.
- پێویستە کێشەکانیان لە ڕێگەی دان و ستاندنەوە چارەسەر بکەن.
- دەبێ دایك و باوکەکان بزانن بە چ شێوەیەك سەرەدەری لەگەڵ هەست و سۆزەکانی منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ منداڵ بە ئازادی گوزارشت لە هەست و سۆزەکانی خۆی بکات.
- دەبێ دایك و باوکەکان گوێ لە منداڵەکانیان بگرن و هەست و سۆزەکانیان بەهەند وەربگرن.
- دەبێ دایك و باوکەکان بزانن کە نادیدەگرتنی هەست و سۆزەکانی منداڵ چ زیانێکی بۆ خودی منداڵ و خێزان و کۆمەڵگە هەیە.
- دەبێ دایك و باوکەکان ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- دەبێ دایك و باوکەکان بەشێوەیەکی ئارام و دوور لە توندوتیژی سەرەدەری لەگەڵ منداڵ بکەن.
- دەبێ دایك و باوکەکان خۆیان لە تۆڵەسەندنەوە و ناکۆکی و کێشە و بگرە و بەردەکانی ناو خێزان بپارێزن، بەتایبەتی لە پێش چاوی منداڵەکانیان.

## ئاشنانەبوونی دایکان و باوکان بە زیانەکانی تەکنەلۆجیای سەردەم

شۆڕشی زانستی و تەکنەلۆجی، لە بنەڕەتدا لەپێناو بەختەوەرکردنی مرۆڤ بەرپا بووە، واتە، بۆ ئەوە هاتووەتە ئاراوە، تاکو جوانی و خۆشی بە ژیان ببەخشێت و، مەینەتی و نەهامەتییەکانی جیهانی مرۆڤایەتی نەهێڵێت.

بۆیە کەس ناتوانێ نکۆڵی لەو ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە بکات، کە تەکنەلۆجیا توانی ژیانی مرۆڤ لە نەخۆشییەوە بەرەو خۆشی، لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکی، لە سەختییەوە بەرەو ئاسانی، لە شەکەتییەوە بەرەو حەسانەوە بباد، چونکە ئاساناکارییەکی زۆری بۆ مرۆڤ کرد، تاکوگۆڕانکارییەکی بنەڕەتی و ڕیشەیی لە ژیانی خۆیدا بێنێتە کایەوە و بتوانێ بچنە ناو قووڵایی دەریا و زەریا و بۆشایی ئاسمان و سەر پشتی ئەستێرە و هەسارەکان و، وا بکات کە زووتر و شایستەتر زامەکانی خۆی سارێژ بکات و دەردەکانی خۆی تیمار بکات و کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات و گرێکوێرەکانی خۆی بکاتەوە.

هەروەها تەکنەلۆجیا توانی مەودای نێوان کێشوەرەکان و وڵاتانی جیهان کەم بکاتەوە و جیهان بکاتە گوندێکی بچووک.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە تەکنەلۆجیا هیچ زیانێکی نەبێت، بەپێچەوانەوە، ئەگەر بەشێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە سەرەدەری

لەگەڵیدا نەکرێت و بەشارەزایی و زانایی و دانایی نەهێتە بەکارهێنان، زیانی زۆر لە قازانجی زیاتر دەبێت و بە زیانی مرۆڤ تەواو دەبێت، بەتایبەتی تەکنەلۆجیای ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان و ئامێرە جەنگییەکان و کۆمەڵکوژییەکان!!!

مخابن! هەڵەیەکی دیکە، لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە خراپ بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا و ئاشنانەبوونیان بە زیانەکانی.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێکی جیاجیا دەگەڕێتەوە:

- ناوشیاری و بێئاگایی دایك و باوك لە زیانەکانی تەکنەلۆجیا.
- ئاشنانەبوون بە تەکنەلۆجیا، بەتایبەتی ئامێرە زیرەکەکان.
- نەخوێندەواری و نزمیی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوە.
- خۆدەرخستن و خۆپەسنین.
- بەنازپەروەردەکردنی منداڵ.
- دەوڵەمەندی و هەڵڕشتنی پارە بەسەر منداڵەکانیاندا.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك بە شێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە سەرەدەری لەگەڵ تەکنەلۆجیا نەکەن، هەم بە زیانی منداڵەکانیان تەواو

دەبێت، هەمیش بە زیانی دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگە بەگشتی، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ لەسەر بەکارهێنانی ئامێرەکان ئالۆدە دەبێت و ناتوانێ دەستبەرداری بێت.
- بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای نوێ لەلایەن منداڵەوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، کاریگەری نەرێنی لەسەر گەشەی هۆشی منداڵ جێدێڵێ.
- منداڵ لە تەمەنی زوودا، نازانێ لایەنی ئەرێنی و نەرێنی تەکنەلۆجیا لێکجیابکاتەوە، یاخود خۆی لێ بپارێزێت، بۆیە بەخراپی بەکاری دێنێ و بە زیانی دەشکێتەوە.
- خراپ بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا، کاریگەری نەرێنی لەسەر گەشەی منداڵ و سنووردارکردنی توانا زەینی و هزری و زانستی و ژیرییەکانییەوە هەیە.
- دەبێتە هۆکارێك بۆ چەقبەستوویی منداڵ و گۆشەگیربوونی و دوورکەوتنەوەی لە دۆست و هاوڕێ و تەنانەت خوشك و برا و دایك و باوکیشی.
- دەبێتە هۆکارێك بۆ سەرنەکەوتنی منداڵ لە قوتابخانە و گشت بوارەکانی ژیاندا.

- منداڵ تووشی لاساری و یاخیبوون و بەلاڕێداچوون دەبێت.
- منداڵ دووچاری قەڵەوی و زیادکردنی کێش دەبێت.
- منداڵ دووچاری زۆر نەخۆشی دەبێت، بەهۆی ئەو تیشکانەوە کە لە ئامێرەکانەوە دەردەچن و بەر جەستەی منداڵ دەکەون.
- دەبێتە هۆی چاوکزی و تەمبەڵی منداڵ.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایک و باوک بەشێوەیەکی زانستیانە و بابەتییانە سەرەدەری لەگەڵ تەکنەلۆجیای نوێ بکەن و خۆیان و منداڵەکانیان لە زیانەکانی پارێزراو بن، پێویستە ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- پێویستە دایک و باوکەکان ئاشنا بن بە زیان و قازانجەکانی تەکنەلۆجیا، بۆ ئەوەی خۆیان و منداڵەکانیان لە زیانەکانی بپارێزن و سوود لە لایەنە ئەرێنییەکەی وەربگرن.
- پێویستە بە وریایی سەرەدەری لەگەڵ تەکنەلۆجیا بکەن.
- پێویستە چاودێری منداڵەکانیان بن و بە ڕەهایی تەکنەلۆجیا نەخەنە بەردەستی منداڵەکانیان، بەتایبەتی لە تەمەنی منداڵی و هەرزەکاری.
- پێویستە سوود لە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا وەربگرن.

- پێویستە نەچنە ژێر باری هەموو داواکارییەکانی منداڵەکانیان و تەنیا ئامێرە پێویستەکان بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن.
- پێویستە ئاشنا بن بە شێوازی بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا و ئامێرە زیرەکەکان.
- پێویستە خۆیان لە پارەهەڵڕشتن بەسەر منداڵەکانیاندا بپارێزن.
- دەبێ خۆیان لە بەنازپەروەرەکردنی منداڵەکانیان بپارێزن.
- دەبێ خاوەن ویست و بڕیاری خۆیان بن و لەکاتی پێویست دا بڕیار بدەن.
- دەبێ هاوکاری و هەماهەنگییەکی زۆر باش لە نێوان دایك و باوك دا هەبێت.
- دەبێ لەبڕی توندوتیژی و زمانی زبر، زمانی لێکتێگەیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ منداڵەکانیان بەکاربهێنن.
- دەبێ بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا بەشێوەیەکی مامناوەندی بێت، واتە، "نە شیش بسووتێت، نە کەباب".

## تڕۆکردنی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە، لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە تڕۆکردنی منداڵ، بە واتایەکی دیکە، هەندێ دایک و باوک، منداڵەکانیان لە ناو خەڵك و دۆست و هاوڕێکانیاندا سووك و تڕۆ دەکەن، ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- پەنگخواردنەوەی ڕق و کینە لە ناخ و دەروونیاندا.
- هەبوونی هەستی تۆڵەسەندنەوە.
- هەبوونی توندوتیژی خێزانی.
- نەبوونی پلان و بەرنامەڕێژی.
- بێکاری و هەژاری.
- بە چاوێکی کەم سەیرکردنی منداڵ.
- ئاشنانەبوون بە مافەکانی منداڵ.
- فرە منداڵی.
- سەرقاڵی و پڕکاری.
- بەهەڵە سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵ.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- فشارە دەروونی، ژیری، خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان.
- نەبوونی توانای خۆکۆنترۆڵکردن و، پەنابردن بۆ توندوتیژی و شەڕەنگێزی.
- هەبوونی نەخۆشی جەستەیی و دەروونی، وەك: دڵەڕاوکێ و خەمۆکی.

- ئالۆدەبوون بە مادده هۆشبەرەکان.
- کێشە ئابوورییەکان.
- کێشە کەسۆکی و خێزانییەکان.
- چاولێکەری.
- لاساری و دەستنەخۆشی منداڵ.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك هەڵەی خۆیان ڕاستنەکەنە و بەردەوام بن لەسەر ترۆکردنی منداڵ، ئەوا منداڵ، ڕووبەڕووی زەرەر و زیانێکی زۆر دەبێتەوە، کە لەم چەند خاڵەدا چڕ دەکەینەوە:

- منداڵ هەست بەخۆکەمزانین دەکات.
- منداڵ ناتوانێ گەشە بە توانا زەینی و هزری و زانستی و جەستەیی و ژیرییەکانی خۆی بدات.
- لە بەهرەکانی بێبەش دەبێت.
- خەڵك بە چاوێکی کەم سەیری دەکات.
- دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی نامێنێ.
- لە ئەرك و کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.
- بەلاڕێدا دەچێت و دووچاری لاساری و یاخیبوون دەبێ.
- دایك و باوك و کۆمەڵگە بە گشتی لە بەهرە و تواناکانی بێبەش دەبن و دەبێتە بار بەسەر شانیانەوە.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە دایك و باوك، واز لە تڕۆکردنی منداڵ بهێنن، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- وەك مرۆڤ سەیری منداڵ بکەن، مرۆڤیش خاوەن ڕێز و بەها و شکۆمەندییە.
- مافە ماددی و مەعنەوییەکانی منداڵ بپارێزن.
- ڕیز لە تایبەتمەندییەکانی منداڵ بگرن.
- لە پێش چاوی خەڵك و هەڤاڵانی نەشکێننەوە و تەرق نەکەنەوە.
- خۆیان لە هەموو جۆرە توندوتیژییەك بەدوور بگرن.
- دادپەروەری لە نێوان منداڵەکانیاندا بەرپا بکەن.
- لە کاتی کێشە و قەیرانەکاندا، دان بەخۆیاندا بگرن.
- ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- چاو لە کەسانی نەزان و نەفام نەکەن.
- کێشەکانیان بە گفتوگۆ و دان و ستاندن چارەسەر بکەن.
- لە کاتی پێویست سەردانی کەسانی شارەزا و پسپۆر بکەن.
- سۆز و خۆشەویستی خۆیان بە منداڵ ببەخشن.

## نەبوونی هەماهەنگی و یەک هەڵوێستی لە نێوان دایک و باوک

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە نەبوونی هەماهەنگی و یەك هەڵوێستی لە نێوان ئەواندا، واتە هەندێ لە دایکان و باوکان هیچ جۆرە هەماهەنگییەکیان لە نێواندا نییە، بۆیە کاتێ یەکێکیان بڕیارێك دەدات، یان کارێك بە منداڵ دەستپێرێ، ئەویتریان بڕیارێکی هاودژ دەردەکات، یان کارێکی هاودژ بە منداڵ دەسپێرێ، ئەمەش سەر لە منداڵ دەشێوێنێ و ڕێی ڕاستی لێ ون دەکات و نازانێت کامیان هەڵبژێرێت و بەگوێی کامەیان بکات، دایك، یان باوك، یان هیچ کامیان؟!

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێکی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە :

- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی لە نێوان دایك و باوك.
- پرس و ڕاوێژ بەیەکتری نەکردن لە کارەکانیاندا.
- دووری دایك و باوك لە یەکترییەوە، چ بەهۆی کار یان نەخۆشی یان هەر هۆکارێکی دیکە.
- درك نەکردن بە گرنگی هەماهەنگی.
- نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوکەکە.
- هەست نەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- خۆدزینەوە لە بەرپرسیارەتی.
- نەخوێندنەوەی یەکتری.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- هەبوونی ناکۆکی لەسەر چۆنیەتی پەروەردە و فێرکردنی منداڵ.

- خۆبەزلزانین و لووتبەرزی دایك و باوك.
- بە چاوێکی کەم سەیرکردنی منداڵ.

ئەڵبەتە، ئەگەر هەماهەنگییەکی باش و تەواو لە نێوان دایکان و باوکاندا نەبێت بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان، هەم خۆیان تووشی کێشە دەبن، هەم منداڵەکانیان و کۆمەڵگەش، چونکە ڕاستەوخۆ کاریگەرییەکی نەرێنی دەبێت لەسەر ئاکار و ڕەفتار و کردارەکی تاك و کۆمەڵ، گرنگترین ئەو زیانانەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

- بە پەیڕەوکردنی ئەم شێوازە چەوت و هەڵەیە، منداڵ دەبێتە یەکەم قوربانی.
- منداڵ نازانێ دایکی ڕاستە یان باوکی!!!
- منداڵ سەری لێدەشێوێت و نازنێ ڕاست کامەیە و چەوت کامەیە!
- منداڵ ڕووبەڕووی هەڵوێستی هاودژ دەبێتەوە.
- ناتوانێ لە کاتی گونجاو، بڕیاری ڕاست بدات.
- متمانە و بڕوای بەخۆی و دایك و باوکی لاواز دەبێ.
- ڕووبەڕووی کێشە و بەریەککەوتن دەبێتەوە.
- زیان بە کەسایەتی و بەرژەوەندی منداڵ دەگەیەنێت.
- لە ئەرك و کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.
- ناتوانێ لە ئایندەدا کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات.
- هەمان هەڵەی دایك و باوکی دووبارە و چەندبارە دەکاتەوە.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان بتوانن نەوەیەکی زانا و دانا و بەتوانا و وشیار و بێدار پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن، دەبێ هەماهەنگییەکی باش و پتەو لە نێوانیاندا هەبێت و ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- پێویستە لەسەر گشت بابەتە پەروەردەییەکان، گفتوگۆ و هەماهەنگییان هەبێت.
- دەبێ بەبێ هەماهەنگی یەکتری، بڕیار لەسەر بابەتە چارەنووسسازەکان نەدەن.
- دەبێ پرس و ڕاوێژ بەیەکتری بکەن.
- دەبێ پلان و ستراتیژیان بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان هەبێت.
- دەبێ لەکاتی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، کێشەکانیان وەلاوەبنێن.
- دەبێ خۆیان لە بیرتەسکی و دەمارگیری و خۆبەزلزانی بپارێزن.
- دەبێ پێکەوە هێڵە گشتییەکانی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان دیاری بکەن.
- دەبێ ئاشنابن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- دەبێ هەست بەبەرپرسیارەتی بکەن و خۆیان لە ئەرك و کارەکانیان نەدزنەوە.
- پێویستە زوو بڕیار نەدەن.
- دەبێ بەشێك بن لە چارەسەر، بەشێك نەبن لە کێشە.

## پشتبەستن بە کەسانی دیکە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵدا

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە پشتبەستن بە کەسانی دیکە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان.

واتە هەندێ لە دایکان و باوکان، بە پاساوی فرەکاری، یان دوورکەوتنەوە لە ماڵەوە، یان نەخۆشی یاخود نەبوونی دەسەڵات بەسەر منداڵەکانیان و...تاد. خۆیان لە ئەرکی پیرۆزی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان دەدزنەوە و ئەم ئەرکە قورسە لەسەر شانی خۆیان هەڵدەگرن و دەخەنە سەرشانی کەسانی دیکەی وەك: باپیرە، مام، خاڵ و مامۆستا و ئامۆزا و....تاد.

ئەڵبەتە هەبوونی ئەم حاڵەتە بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەم جۆرە دایك و باوکانە، بڕوا و متمانەیان بە خۆیان نییە.
- ئەم جۆرە دایك و باوکانە، پلان و ستراتیژییەتێکی ڕۆشن و دیاریان نییە بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان
- ئاشنانین بە بنەماکانی پەروەردە و فێرکردنی منداڵ
- هەست بەبەرپرسیرەتی ناکەن و خۆیان لەو ئەرکە قورسە دەدزنەوە.
- کەسانی کەمتەرخ و بێباکن
- درك بە مەترسی ئەم کارە ناکەن.
- لاسایی کەسانی دیکە دەکەنەوە.
- ویست(ئیرادە)یەکی لاوازیان هەیە، بۆیە بەئاسانی کەسانی دیکە دەست لە کاروباریان وەردەدەن.

بێگومان ئەم جۆرە پەنابردنە بۆ کەسانی دیکە، زۆرترین کێشە بۆ منداڵ و دایك و باوکەکە و تەنانەت کۆمەڵگەش دروست دەکات، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵ بە خواست و ئارەزووی دایك و باوکی پەروەردە نابێ، بەڵکو بە ئارەزووی ئەو کەسانە پەروەردە دەبێ، کە ئەم ئەرکە دەگرنە ئەستۆ و کاریگەرییان لەسەر منداڵ هەیە.
- منداڵ هیچ بڕوا و متمانەیەکی بە دایك و باوکی نامێنێ.
- منداڵ بڕوا و متمانەی بەخۆی نابێت و ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- منداڵ لە کاتی پەروەردەکردنیدا دووچاری زۆر شتی هاودژ دەبێتەوە.
- منداڵ بەدەست پەروەردەی فرە کەسییەوە دەناڵێنێ.
- منداڵ بەشێوەیەکی سروشتی پەروەردە نابێ و لە ناو ژینگەیەکی ناتەندروستدا گەشە دەکات.
- لە ئایندەدا، منداڵ ناتوانێ وەك کەسێك بەهرەمەند و بەتوانا خزمەت بە کۆمەڵگە بکات.
- کێشە بۆ دایك و باوکی و خێزانی دروست دەبێت.
- مەودایەکی زۆر لە نێوان خۆی و دایك و باوکی و ئەندامانی دیکەی خێزانیدا دروست دەبێت و لێکدووردەکەونەوە.
- ئەو سۆز و خۆشەویستییەی کە پێویستە لە نێوان منداڵ و دایك و باوکی هەبێت، بەرەو کزی و لاوازی دەچێت.
- منداڵ لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە دایکان و باوکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەرکی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان بگرنە ئەستۆ و ئەم ئەرکە سەختە نەخەنە سەرشانی کەسانی دیکە، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- هەست بەبەرپرسیارەتی بکەن و مشۆری منداڵەکانیان بخۆن.
- خۆیان لە ئەرك و کارەکانیان نەدزنەوە.
- پلانێکی تۆکمە و ستراتیژییان هەبێت بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان.
- نەهێڵن هیچ کەسیك دەست بخاتە ناو کاروباری ئەوانەوە، بەتایبەتی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان.
- خۆیان ئاشناکەن بە بنەماکانی پەروەردە و فێرکردن.
- ڕێز لە مافەکانی منداڵ بگرن.
- خۆیان بەدوور بگرن لە کاری هەڕەمەکی.
- بڕیاری خۆیان بەدەستی خۆیان بێت.
- پێویستە بە پرس و ڕاوێژ کێشەکانیان چارەسەر بکەن.
- دەبێ لە کاتی پێویستدا پرس و ڕا بە کەسانی پسپۆر و شارەزا بکەن.

## بێبەشكردنی منداڵ لە مافی خوێندن و فێربوون

هەڵەیەكی دیكە لەو هەڵە باوانەی كە زۆرێك لە دایكان و باوكان دەرهەق لە منداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بێبەشكردنی منداڵ لە مافی خوێندن و فێربوون. ئەمەش بۆ چەندین هۆكاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەژاری و دەستكورتی.
- فاكتەری كولتووری.
- پیاوسالاری و گەورەسالاری.
- كار كردن بە منداڵ.
- دووردەستی و هەبوونی كێشەی هاتوچۆ.
- هەست نەكردنی دایك و باوك بە بەرپرسیارەتی.
- خەمساردی و كەمتەرخەمی دایك و باوك.
- بەهەندوەرنەگرتنی خوێندن.
- دواكەوتوویی و پاشكەوتن.
- هەبوونی جەنگ و نەبوونی ئاسایش.
- ئاشنانەبوون بە مافەكانی مرۆڤ و منداڵ.

ئەڵبەتە ئەگەر منداڵ لە مافی خوێندن و فێربوون بێبەش بكرێت و لە قوتابخانە دابڕێت، جگە لە منداڵ، دایك و باوكی و كۆمەڵگەش بەگشتی ڕووبەڕووی زیانێكی زۆر دەبێتەوە، كە گرنترینیان ئەمانەن:

- منداڵ لە مافی خوێندن و فێربوون بێبەش دەبێت.
- منداڵ ناتوانێ بەرگەی تەحەدییاتەكانی ژیان بگرێت.

- منداڵ بە کۆڵەمەرگی و چەرمەسەری ژیان بەسەر دەبات.
- بەهرە و توانا زەینی و هۆشی و هزری و زانستییەکانی منداڵ وەك پێویست گەشە ناکەن.
- منداڵ ناتوانێ وەك پێویست خزمەت بە خۆی و کۆمەڵگە بکات.
- منداڵ لە ئاستێکی بەرزی زانستی و رۆشنبیری و هونەری و وەرزشی بەهرەمەند نابێت.
- منداڵ زوو زوو لەلایەن کەسانی دیکەوە دەستخەڕۆ دەکرێت.
- منداڵ متمانەی بە خۆی نامێنێت.
- منداڵ لە ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتیدا ڕووبەڕووی زۆر کێشە و ئاستەنگی جیاجیا دەبێتەوە.
- کۆمەڵگە لە توانا و وزە و بەهرەکانی بێبەش دەبێت.
- لە ئایندەدا ناتوانێ بەشێوەیەکی سەرکەوتوو، منداڵەکانی خۆی پەروەردە بکات.

### چارەسەری ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ لە مافی خوێندن و فێربوون بێبەش نەبێت و بتوانێ لێی بەهرەمەند بێت، پێویستە لەسەر دایکان و باوکان ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- دەبێ دایکان و باوکان بۆ خوێندن و فێربوونی منداڵەکانیان، پلان و ئامانجیان هەبێت.

- خوێندن و فێربوون مافێکی سەرەکی و بنەڕەتی منداڵە، بۆیە نابێ دایك و باوك ئەو مافە لە منداڵ بستێنن.
- پێویستە دایك و باوکەکان گشت ئاسانکارییەك بۆ منداڵ بکەن، بە ڕەگەزی نێر و مێیەوە، بۆ ئەوەی لە خوێندن و فێربوون دانەبڕێت.
- نابێ دایك و باوك بە پاساوی هەژاری و دەستکورتی، یان دووری قوتابخانە لە ماڵەوە، یاخود نەریت و کولتووری کۆمەڵگە، منداڵ لە خوێندن و فێربوون بێبەش بکەن، یان لە قوتابخانە دەریهێنن.
- نابێ خوێندن و فێربوونی منداڵ بکرێتە قۆچی قوربانی هیچ شتێکی دیکە.
- دەبێ دایك و باوکەکان هەموو ئەو ئاستەنگ و کۆسپانە وەلاوەبنێن کە دەکەونە سەر ڕێگای خوێندن و فێربوونی منداڵ.
- نەك هەر نابێ دایك و باوکەکان، هۆکار بن بۆ دوورکەوتنەوەی منداڵەکانیان لە قوتابخانە و خوێندن و فێربوون، بەڵکو پێویستە تا ئەوپەڕی توانا، هەوڵدەن باشترین و بەهێزترین و نایابترین جۆری خوێندن بۆ منداڵەکانیان دەستەبەر بکەن، تاکو هاوشانی قوتابخانە، بتوانن نەوەیەکی زانا و دانا و بەتوانا و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پشتبەخۆبەستوو پێبگەیەنن و تێبگەیەنن.

## گوێ نەدان بە ترسەکانی منداڵ

منداڵ لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك ترس و بیمی جیاجیا دەبێتەوە، وەك: ترس لە مردن، ترس لە هاتوچۆ، ترس لە تاریکی، ترس لە جنۆکە، ترس لە هاوڕێی لاسار و کەلەگا، ترس لە قوتابخانە، ترس لە تاقیکردنەوە و دەرنەچوون و ترس لە هێنانی نمرەیەکی کەم، ترس لە ئاژەڵە دڕندەکان، ترس لە دز و ڕێگرەکان، ترس لە پۆلیس و کەسانی نامۆ و...تاد.

زۆر مخابن! هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە گوێ نەدان بە ترس و بیمەکانی منداڵ.

ئەڵبەتە گوێ نەدانی دایك و باوك بەم هەموو ترسانەی کە لای منداڵ پەیدا دەبێت، بۆ چەندین فاکتەری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەست نەکردنی دایك و باوك بە ئەرك و بەرپرسیارەتی خۆیان.
- خەمساردی و کەمتەرخەمی دایك و باوك.
- ناوشیاری و بێئاگایی دایك و باوك.
- ئاشنانەبوونی دایك و باوك بە سروشت و تایبەتمەندییەکانی منداڵ.
- گوێ نەدان بە خواستەکانی منداڵ.
- نەبوونی کاتی پێویست بۆ دانیشتن لەگەڵ منداڵەکانیان بەهۆی فرەکارییەوە.
- بەهەندوەرنەگرتنی ترسەکانی منداڵ.
- هەبوونی کێشەو بگرە و بەردەی خێزانی.

- پشتگوێخستنی بنەمای پرس و ڕاوێژ.
- تێنەگەیشتن لە منداڵ.
- نەخوێندنەوەی منداڵ.
- نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- هەست نەکردن بە کاریگەرییە نەرێنییەکانی ترسەکانی منداڵ لەسەر گەشەی منداڵ لە گشت ڕوویەکەوە.

ئەڵبەتە ئەگەر منداڵ ئەم هەموو ترسەی هەبێت و لە ناخیەوە هەست بە ترس و بیم بکات و دڵنیا و ئاسوودە نەبێت لە ژیان و دوارۆژی خۆی، دووچاری زیانێکی مەزن دەبێتەوە، کە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا کورت کەینەوە:

- منداڵ دەبێتە کەسێکی ترسنۆك و ورەبەزیو.
- منداڵ ناتوانێ پشت بە توانا و شیانەکانی خۆی ببەستێت و متمانەی بەخۆی نابێت.
- منداڵ دووچاری زیانێکی زۆری جەستەیی و هۆشی و هزری و زانستی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و...تاد دەبێت.
- منداڵ ناتوانێ بەسەر کۆسپە و ئاستەنگەکانی ژیاندا زاڵ بێت.
- منداڵ لە گەمەکانی ژیاندا دەدۆڕێنێت.
- منداڵ خۆی لە ئەرك و کارەکای دەدزێتەوە.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی بەدگومان و گومانی خراپ لە هەموو شتێك دەکات.

- منداڵ متمانە و بڕوای بە دایك و باوكی نامێنێت.
- مەودایەك دەكەوێتە نێوان منداڵ و دایك و باوكەكانی.
- منداڵ دەبێتە كەسێكی گۆشەگیری و دوورەپەرێز.
- خێزان و كۆمەڵگە بەگشتی، لە توانا و وزە و بەهرەكانی ئەو جۆرە منداڵانە بێبەش دەبێت.

## چارەسەری ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی ترسی منداڵ بڕەوێتەوە و بتوانێ بەشێوەیەكی ئاسایی قۆناغەكانی ژیان ببڕێت، دەبێ دایك و باوكەكانی كار لەسەر نەهێشتنی هەموو ئەو ترسانە بكەن، كە بەرەو ڕووی دەبێتەوە، بۆیە پێویستە ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- پێویستە بەباشی منداڵەكانیان بناسن.
- پێویستە دایكان و باوكان پلان و ئامانجیان هەبێت بۆ پەروەردە و فێركردنی منداڵ.
- پێویستە لە ڕووی جەستەیی و ڕۆحییەوە لە منداڵەكانیان نزیك بن.
- پێویستە لە ئاست متمانەی منداڵەكانیان بن.
- دەبێ ترسەكانی منداڵ بەهەند وەربگرن و هیچ ترسێكی منداڵ بەبێ چارەسەر نەهێڵنەوە.
- گەرەكە بەشێوەیەكی زانستییانە و بابەتییانە سەرەدەری لەگەڵ ترسەكانی منداڵ بكەن.

- نابێ دڵتەنگی و نیگەرانییەکانی منداڵ نادیدە بگرن.
- پێویستە چارەسەری ڕیشەیی بۆ نەهێشتنی ترسەکانی منداڵ بدۆزنەوە.
- پێویستە خۆیان هۆکار و سەرچاوەی ترس نەبن بۆ منداڵ.
- پێویستە ئەو هۆکارانە نەهێڵن کە دەبنە هۆی دروست کردنی ترس و بیم بۆ منداڵ.
- پێویستە هەماهەنگی و هاوکارییەکی تۆکمە لە نێوان دایک و باوکدا هەبێت.
- گەرەکە دایك و باوك ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکانی سەردەم.
- پێویستە لەکاتی پێویست سەردانی کەسانی دەروونزان و پسپۆر و شارەزا بکرێت.
- پێویستە دایك و باوك بزانن بۆچی و لەبەرچی منداڵ دەترسێت، چونکە دۆزینەوەی نەخۆشییەکە، نیوەی چارەسەرە و چارەسەرەکە ئاسان دەکات.
- پێویستە دایك و باوکەکان، منداڵ بە تەنیا جێنەهێڵن.
- پێویستە دایکان و باوکان چاودێربن بەسەر منداڵەکانیانەوە، بەتایبەتی لە ماڵەوە، کاتێ بەدیار تەلەفزیۆنەوە دادەنیشن، بۆ ئەوەی سەیری فیلە ترسناکەکان نەکەن.

- پێویستە بەهیچ شێوەیەك ڕێگە بە منداڵ نەدرێت کەوا بە کەیفی خۆی و بەشێوەیەکی ئازادانە سوود لە ئەنتەرنێت وەربگرێت، چونکە ئەم کارە زۆر بڤە و مەترسیدارە!!
- پێویستە دایك و باوکەکان ڕۆڵیان هەبێت لە ڕەواندنەوەی ترسە فرە جۆرەکانی منداڵ.
- پێویستە دایك و باوکەکان ئەو هەستە بۆ منداڵ دروست بکەن کەوا جددین لە نەهێشتنی ئەو ترسانەی کە بەرەو ڕووی دەبنەوە.
- پێویستە دایك و باوك هەمیشە بەشێك بن لە چارەسەر، بەشێك نەبن لە کێشە.
- پێویستە هاوکاری و هەماهەنگییەکی زۆر باش لە نێوان دایك و باوکی منداڵ لەلایەك و، دایك و باوکی منداڵ و قوتابخانە و مامۆستایان لەلایەکی دیکەوە هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە ترسەکانی منداڵ بڕەوێننەوە و چارەسەر بکەن.
- پێویستە ڕێگە بە منداڵەکانیان بدەت کەوا ئازادانە گوزارشت لە ترس و بیمەکانی خۆیان بکەن.

## گوێ نەدان بە تەندروستی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە زۆرێك لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە گوێ نەدان بە تەندروستی منداڵەکانیان، بە واتایەکی دیکە، ئەو جۆرە دایك و باوکانە لە خەمی تەندروستی منداڵەکانیاندا نین و وەك پێویست ئاوڕی لێنادەنەوە و تەنانەت ئامادە نین پارە و کاتی خۆیان بە قوربانی تەندروستی منداڵەکانیان بکەن.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- بێ ڕەحمی و چاوچنۆکی دایك و باوك.
- هەست نەکردنی دایك و باوك بە بەرپرسیارەتی خۆیان.
- خەمساردی و بێباکی دایك و باوك لە ئاست منداڵەکانیان.
- هەژاری و دەستکورتی دایك و باوك و خێزان.
- بێکاری و نەبوونی کار.
- فرەکاری و سەرقاڵی و نەبوونی کاتی پێویست بۆ چاودێری و بەدواداچوون کردن بۆ تەندروستی منداڵ.
- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایك و باوك.
- نەخوێندەواری دایك و باوك.
- درك نەکردن بەو مەترسییانە، کە بەهۆی نەخۆشییەکانەوە ڕووبەڕووی منداڵ دەبێتەوە.
- هەبوونی ژمارەیەکی زۆری منداڵ.

بێگومـان ئەگـەر تەندروسـتی منـداڵ لەلایـەن دایـك و باوكییـەوە پشتگوێ خرا و فەرامۆش کرا، نەك هەر خودی منداڵەکە، بگرە دایـك و بـاوك و خێـزان و کۆمەڵگـەش، کـەم تـا زۆر زەرەرمەنـد دەبـن، کـە دەتوانین ئەو زیانانە لە چەند خاڵێکدا چڕکەینەوە:

- ئەگـەر تەندروسـتی منـداڵ نەخرێتـە ژێـر چاودێرییـەکی وردی پزیشـکییەوە، منـداڵ ڕووبـەڕووی کێشـەگەلێك دەبێتـەوە، لەوانـەش ئەگەری ئـەوە هەیـە بمرێـت یـان دووچـاری نەخۆشـییەکی کوشـندە و درێژخایەن بێت.
- منداڵ بە حوکمی ئەوەی مرۆڤێکی ناسکە، بۆیـە زوو زوو دووچاری نەخۆشی دەبێت، لەم سۆنگەیەوە، ئەو نەخۆشییانە، چ درێژخایـەن بـن یان کورت خایەن، ئەگەر بە شێوەیەکی زانستییانە چارەسـەر نـەکرێن، کاریگەرییـەکی نـەرێنی لـەسـەر تەندروسـتی منـداڵ جێدێڵێت و بـەرەو هەڵدێر دەبات.
- هەر جۆرە نەخۆشییەك ڕووبەڕووی منداڵ ببێتەوە، زیـانێکی زۆر بـە جەستە و مێشکی منداڵ دەگەیەنێت.
- گوێ نەدان بە تەندروستی منداڵ، وا دەکات کە لـە ئاییندەدا دایـك و باوکەکان باجێکی زۆری ماددی و مەعنەوی بدەن، چونکـە منـداڵ ئەمانەتێکە، لە ئەستۆی ئەواندایە، بۆیە بە زایەکردنی ئـەو ئەمانەتـە، چارەنووسی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە!!
- ئەگەر نەخۆشییەکانی منداڵ لە کاتی خۆیدا چارەسەر نەکران، ئەوا تەشەنە دەکات و چارەسـەرکردنی ئەستەم دەبێت.
- منداڵ بە شێوەیەکی ئاسایی گەشە ناکات.

- منداڵ دەبێتە بار بەسەر شانی خێزان و کۆمەڵگە و حکومەتەوە.
- منداڵی نەخۆش، هەست بە تام و خۆشی ژیان ناکات.
- منداڵی ناتەندروست، لە ئەرك و کار و ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.

**چارەسەری ئەم هەڵەیە**

- پێویستە دایك و باوکی منداڵ تا ئەندازەیەکی باش لە ڕۆشنبیریی تەندروستی بەهرەمەند بن، بۆ ئەوەی بتوانن بەشێوەیەکی ڕاست و دروست سەرەدەری لەگەڵ تەندروستی منداڵدا بکەن.
- پێویست دایك و باوك وەك پەرژینێك بن بۆ پاراستنی منداڵ لە نەخۆشییەکان، چونکە پاراستن لە چارەسەرکردن باشترە!
- منداڵ دەبێ هەر لە سەرەتاوە، بخرێتە ژێر چاودێری پزیشکییەوە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی تەندروست گەشە بکات و لە نەخۆشییە درم و کوشندە و درێژخایەنەکان پارێزراو بێت.
- نابێ تەندروستی منداڵ ببێتە قوربانی بەرژەوەندییە ماددیەکانی دایك و باوك.
- نابێ تەندروستی منداڵ ببێتە قوربانی چاوچنۆکی و ڕەزیلی دایك و باوك.
- نابێ تەندروستی منداڵ، بە پاساوی هەژاری، یان فرەکاری، یان فرە منداڵی و...تاد پشتگوێ بخرێت و فەرامۆش بکرێت.
- دەبێ دایك و باوکەکان بزانن کە یەکێك لە مافەکانی منداڵ بریتییە لە هەبوونی بیمەی تەندروستی.

- نابێ بە پاساوی جیاجیا، منداڵەکانی خۆیان لە مافی خوێندن و فێربوون و یاری و وەرزشکردن بێبەش بکەن، چونکە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە تەندروستی منداڵەوە هەیە.
- پێویستە دایکان و باوکان و قوتابخانە و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، ڕێنمایی و ئامۆژگاری منداڵ بکەن، بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشییەکان.
- ئەرکی دایك و باوکە، خەرجی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی منداڵەکانیان بگرنە ئەستۆ.
- ئەرکی دایك و باوکە خۆراك و پۆشاکی تەواو بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن، بۆ ئەوەی لە بەدخۆراکی و سەرما و گەرما و نەخۆشییەکان پارێزراو بن.
- ئەرکی دایك و باوکە شوێنی حەوانە و نووستن، بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن.
- دەبێ دایکان و باوکان دڵنیا بن لە تەندروستی جگەرگۆشەکانیان.
- ئەو دایك و باوکانەی کە دەرهەق بە تەندروستی منداڵەکانیان، کەمتەرخەم و بێباکن، پێویستە لەلایەن حکومەتەوە ڕێکاری یاساییان بەرامبەر بکرێت و سزا بدرێن.

## تووڕەیی و ڕووگرژی دایک و باوک لەماڵەوە

هەڵەیەکی دیکە، لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان، دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە تووڕەیی و ڕووگرژی دایک و باوک لە ماڵەوە، ئەو تووڕەیی و ڕووگرژییەی دایک و باوکیش لە ماڵەوە بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- دایك و باوك لە ناو ژینگەیەکی ناتەندروست و پڕ لە تەنگژە و بگرە و بەردە و کێشە پەروەردە کراون.
- هەبوونی ناکۆکی و بگرە و بەردە و دەمەقاڵێ لە نێوان دایك و باوکی منداڵ.
- جیاوازی و ناهاوسەنگی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایك و باوکەکان.
- نەبوونی و هەژاری و هەبوونی کێشەی دارایی و باری سەختی ژیان!
- دەستوەردانی کەسوکاری ئەو جۆرە دایك و باوکانە لە کاروباری ژیانی تایبەتی ئەوان.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- بێباکی و کەمتەرخەمی.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی خۆیان.
- پێکنەهێنانی پرۆسەی هاوسەرگیری لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی و لێکتێگەیشتن و یەکتری خۆشەویستن.
- نادیدەگرتنی ماف و بەرژەوەندییەکانی منداڵ و ئەندامانی دیکەی خێزان.
- هەبوونی نەخۆشی جەستەیی و دەروونی و بۆماوەیی.

- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایك و باوك.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوکەکان بەردەوام لەماڵەوە تووڕە و ڕووگرژ بن و هیچ کاتێ خەندە و بزە لەسەر لێوەکانیان نەبینرێت، نەك هەر خۆیان، بگرە منداڵەکانیشیان زەرەرمەند دەبن، کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

- ئەو ماڵە هەمیشە پڕ کێشە و پێکدادان دەبێت.
- خۆشەویستی و سۆز و ڤیان لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان نامێنێت.
- هەموو ئەندامەکانی خێزان هەست بە بێزاری دەکەن.
- ژیان لەو ماڵەدا دەبێت بە ژان!
- منداڵ، هەست بە نیگەرانی و دڵتەنگی دەکات و حەز ناکات بێتەوە ماڵەوە، بۆیە زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ هاوڕێ و دۆستانیدا بەسەر دەبات و زۆر جار دووچاری لاساری و سەرپێچی و کاری قۆڕ دەبێت.
- دایك و باوکەکان کۆنترۆڵیان بەسەر منداڵەکانیان نامێنێت، چونکە وتراوە: (باشترین، دەسەڵات، ئەو دەسەڵاتەیە کە مرۆڤ بەسەر دڵەکاندا زاڵ بێت، نەك جەستەکاندا).
- ئەندامانی خێزان دووچاری چەندین نەخۆشی دەبن وەك: دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و بێ ئومێدی و ڕەشبینی و...تاد.
- کارەکانی خێزان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بەڕێوە ناچن و جۆرە فەوزایەك تێدا بەرپا دەبێت.

- کێشـەکان قـووڵ دەبنـەوە و لەسـەر یـەکتری کەڵەکـە دەبـن، تـا سەردەکێشێ بۆ جیابوونـەوە و ماڵجیایی دایك و بـاوك لەلایـەك و، دایك و باوك و منداڵەکانیان لەلایەکی دیکەوە.
- لەلایەن خەڵکانی دیکەوە دەست لە کاروباریان وەردەدرێت.
- تـەبایی و یـەکرێزی و هاوسـەنگی نێـوان ئەنـدامانی ئـەو ماڵـە تێکدەچێت.
- منداڵ لە زۆر ماف بێبەش دەبێت.
- منداڵ دووچاری لادان و لاساری و یاخیبوون دەبێت.
- خەڵك وەك پێویست هاموشۆی ئەو جۆرە ماڵ و خێزانانە ناکات، ! چونکە حەزی لە دەم و چاوی ڕووگرژ نییە!! بۆیە دووچاری دابڕان و گۆشەگیری دەبن.
- ئەو جۆرە ماڵانە، لە هاوکاری و یارمەتیی خەڵك بێبەش دەبن.
- ڕووگرژی و تووڕەیی دایك و باوك، کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر هەست و سۆز و دەروونی منداڵ جێدێڵێ، بەتایبەتی لە ئایندەدا، وا دەکات منداڵ ببێتە کەسێکی تووڕە و ڕووگرژ و هەڵچۆ و ناتوانێ وەك پێویسـت خـۆی لەگـەڵ خـەڵك و واقـع بگـونجێ و تووشـی پێکدادان و بەریەککەوتن دەبێت.
- تووڕەیی و ڕووگرژی دەبنـە سـەرچاوەی سـەرەکیی زۆرێك لـە کێشـە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان.

## چارەسەری ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی خێزان لە کەش و هەوایەکی لەباردا ژیانی خۆی بگوزەرێنێت و هەمووان، بەتایبەتی منداڵ تێدا هەست بە خۆشی و دڵئاسوودەیی بکات، دەبێ دایک و باوکەکان ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- پێویستە پەیوەندییەکانی دایک و باوک و منداڵ لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی و یەکتر قبووڵکردن و هاوکاری و هەماهەنگی دامەزرا بێت.
- پێویستە دایک و باوک هەمیشە ڕووخۆش و کراوە بن، بەتایبەتی بەڕووی منداڵەکانیان و خەڵکیدا.
- دەبێ ناکۆکییەکانی دایک و باوک، نەبن بەهۆکارێك بۆ لەباربردنی خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی و دڵنیایی ئەندامەکانی دیکەی خێزان.
- پێویستە کێشە کەسۆکییەکان لە ناو ژیانی خێزاندا ڕەنگنەداتەوە، واتە، تێکەڵ بە ژیانی خێزان نەکرێت.
- پێویستە کێشەکان بە هەڵپەسێردراوی نەهێڵنەوە، بۆ ئەوەی چارەسەرکردنیان ئاسان بێت.
- دەبێ دایک و باوک درك بەو ڕاستییە بکەن کە تووڕەیی و ڕووگرژی لە ناو خێزاندا، دەبێتە هۆی لەباربردنی هەنگوینی شیرینی خۆشەویستی!
- بۆ ڕێگریکردن لە سەرهەڵدانی نەخۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان، دەبێت دایک و باوک و ئەندامانی دیکەی خێزان، لەو گوفتار و

ڕەفتار و هەڵسوکەوت و کردارانە دوور کەونەوە، کە دەبنە هۆی تووڕەیی و سەرهەڵدانی تەنگژەی خێزانی.

- دایک و باوک بەرپرسن لە دابینکردنی بەختەوەری و ئاسوودەیی دەروونی منداڵەکانیان، بۆیە دەبێ هەموو ئەو ڕێکار و هۆکارانە بگرنە بەر کە دەبنە هۆی کامەرانی و بەختەوەری خێزان.
- خێزان پێویستی بە کەش و هەوایەکی ئارام و لەبار هەیە بۆ ئەوەی بەها بەرزەکانی وەک: خۆشەویستی و هاوکاری و هەرەوەزی و تەبایی و یەکڕیزی و هەماهەنگی و ئەمانەتداری و دڵسۆزی و وەفاداری و دڵپاکی و نیازپاکی و متمانە تێدا گەشە بکات و جوانی بە ڤیان و ژیان ببەخشێت!

## هار و هاجكردنی منداڵ

هەڵەیەكی دیكە، لەو هەڵە باوانەی كە هەندێ لە دایكان و باوكان دەرهەق بە منداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە هار و هاجكردنی منداڵ، بە واتایەكی دیكە، ئەو جۆرە دایك و باوكانە، زەمینە بۆ هار و هاجبوونی منداڵەكانیان فەراهەم دەكەن و هانیان دەدەن، كە لە گوفتار و ڕەفتار و كرداریاندا توندوتیژ و هار بن، ئەمەش بۆ چەند فاكتەرێكی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هاری و توندوتیژی دایك و باوك.
- نەبوونی سینگفراوانی و لێبوردەیی.
- گەورەبوون لە ژینگەیەكی ناتەندروستدا.
- هەست نەكردن بە بەرپرسیارەتی.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی بەرامبەر بە منداڵەكانیان.
- نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری ئەو جۆرە دایك و باوكانە.
- نەبوونی توانای خۆگونجاندن لەگەڵ خەڵك و دەوروبەر.
- هەبوونی حەزی خۆسەپاندن و تاكڕەوی.
- هەبوونی حەزی باڵادەستی و دەسەڵاتداری.
- هەبوونی حەزی تۆڵەسەندنەوە لەوانی دیكە.
- كورتبینی و ناوشیاری دایك و باوكەكان.
- هەژاری و دەستكورتی.
- هەبوونی شەڕ و بگرە و بەردەی خێزانی و كۆمەڵایەتی.
- پێكەوەنەسازانی دایك و باوك و لێكترازان.

- هەبوونی حەزی خۆپەسنین و خۆهەڵکێشان.
- بۆ دەرخستنی هێزی خۆیان و چاوترسێن کردنی ئەوانی دیکە.

بێگومان ئەگەر دایك و باوك لەسەر ئەم ڕێڕە هەڵەیەی خۆیان بەردەوام بن و سوور بن لەسەر پشتگیریکردنی منداڵ لەسەر دەستدرێژی و سنووربەزێنی و پێشێلکارییەکانی، ئەوا نەك هەر منداڵ، بگرە خۆیان و کۆمەڵگەش زەرەرمەند دەبن و باجەکەی دەدەن، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ دەبێتە کەسێکی توندوتیژ و شەڕەنگێز و، هەر ڕۆژێك تەشقەلە بە کەسێك دەفرۆشێت!
- منداڵ ناتوانێ خۆی لەگەڵ ژینگەی دەوربەر و قوتابخانە و کۆمەڵگەی خۆجێیی بگونجێنێت و، ڕووبەڕووی کێشە و گرفتی جددی دەبێتەوە.
- منداڵ یاسا کارپێکراوەکان پێشێل دەکات و ڕێز لە یاسا و ڕێسا باوەکانی ناو کۆمەڵگە ناگرێت.
- منداڵ لە کارە توندوتیژەکانیدا پشت بە دایك و باوکی دەبەستێت و هەست دەکات بە تەنیا نییە.
- منداڵ بەرەو تاکرەوی و دیکتاتۆریەت و خۆسەپاندن هەنگاو دەنێت.
- منداڵ لە قوتابخانە و ئەرك و کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.
- منداڵ دەبێتە کێشە بۆ دایك و باوکی و خێزانی و کۆمەڵگە بەگشتی.
- منداڵ لە بەهرە و توانا ڕاستەقینەکانی خۆی بێبەش دەبێت.

- منداڵ کە گەورە بوو، ناتوانێ واز لە کارە دزێوەکانی خۆی بێنێـت و لەسەری بەردەوام دەبێت.
- منداڵ هەمیشە دەبێتە بەشێك لە کێشە، نابێتە بەشێك لە چارەسەر.
- منـداڵ، ڕۆژ بەڕۆژ، دوژمـن بۆ خۆی و دایك و باوکی و خزم و کەسەکانی زیاد دەکات.
- لە ئاینـدەدا چارەنووسی منـداڵ دەکەوێتـە مەترسـییەوە و بـاجێکی قـورس دەدات، وەك ئـەو منداڵـەی کـە لـە تەمـەنی منداڵیـدا هێلکەیەکی دزی! بەڵام دایکی منداڵەکە، لەبری ئەوەی لیپرسینەوە و لێپێچینـەوەی لەگەڵدا بکات! دەستخۆشانەی لێکرد!!!! بۆیـە ئـەو منداڵـە بـەردەوام بـوو لـە دزیکـردن و لـە گەنجییـەتیش، وازی لـە دزیکردن نەهێنا، تا لەگەڵ باندێکی دزیکردن، بانێکێکی حکومییان شەلاند!

کاتێ لەگەڵ ئەندامانی ئەو باندە دەستگیرکرا و بەهۆی دزینی پارە و پووڵی دەوڵەتەوە، سزای لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو! گوتی تـەنیا یـەك داواکـاریم هەیـە، حـەز دەکـەم پێش لـە سێدارەدانم دایکم ببیـنم! کـاتێ دایکی هات بۆ سەردانی! گوتی دایـە حـەز دەکـەم زمانـت دەربێنـی، بـۆ ئـەوەی مـاچی بکـەم! کـە زمـانی دەرهێنـا، کوڕەکـەی گـازی لێگـرت و پارچەیەکی لە زمانی دایکی کردەوە!!

بە منداڵەکەیان گوت: بۆچی ئەم کارەت کرد؟

گـوتی: ئـەو ڕۆژەی کـە هێلکەیـەکم دزی! ئەگـەر دایکـم هـانی نەدابامایـە و دەستخۆشـانەی لێنەکردبامایـە و منـی سـزادابایە! ئـەمڕۆ دووچاری ئەم کارەسات و چارەنووسە ڕەشە نەدەبووم!!

- دایـك و باوکـەکان بـە هـار و هـاجکردنی منداڵـەکانیان، پەنجـەی پەشـێمانی دەگـەزن! چونکـە دەبـێ بـزانن ئـەوەی دڕك دەچێنـێ! گـوڵ نادورێتەوە! بەڵکو دەبێ دڕك بچنێتەوە!!!

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوکەکان، خۆیان بەدوور بگرن لە هار و هاجکردنی منداڵەکانیان، پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- دەبـێ دایـك و باوکـەکان خـاوەن پـلان و ئامـانجی خۆیـان بـن لـە پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان.
- دەبـێ دایـك و باوکـەکان خـۆ لـە گشـت کـارێکی تونـدوتیژی و شەڕەنگێزی بپارێزن و لە گوفتار و ڕەفتار و کردارەکانیاندا ئاشتیخواز و ژیاندۆست و مرۆڤدۆست بن.
- نابێ دایك و باوك بەهیچ شێوەیەك بەرگری لە هەڵەکانی منداڵ بکەن.
- نـابێ دایـك و بـاوك هـانی منـداڵ بـدەن بـۆ کـاری شـەڕەنگێزی و توندوتیژی.
- نـابێ دایـك و بـاوك چاوپۆشـی لـە توندوتیژییـەکانی منـدال بکـەن، بەڵکو پێویستە کار بکەن بۆ دوورخستنەوەی منداڵ لە توندوتیژی و هار و هاجی.
- دەبێ دایك و باوکەکان هەوڵدەن منداڵەکانیان لەو کەس و شوێنانە دووربخەنەوە، کە سەرچاوەن بۆ هاری و توندوتیژی و شەڕەنگێزی.

- پێویستە هەماهەنگییەکی توندوتۆڵ و پتەو لە نێوان دایک و باوک لەلایەک و، دایک و باوک و قوتابخانە لەلایەکی دیکەوە هەبێت، بۆ ئەوەی زوو بەزوو کێشەکانی منداڵ چارەسەر بکەن و نەهێڵن کێشەی بچووک گەورە ببێت.
- دەبێ دایک و باوکی منداڵ، نموونە بن لە ڕەوشتبەرزی و ئاکارجوانی، بۆ ئەوەی ببنە نموونەیەکی جوان و زیندوو بۆ منداڵەکانیان، تاکو چاوی لێبکەن.

## سەرچاوە کوردییەکان


١.چۆن سەرکەوتوو دەبیت، دیل کارنگی، وەرگێڕانی سەلام کەریم، بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوار چرا، چاپی یەکەم

٢.هزری سەرکەوتوو، ئۆرایزن نسفوت ماردن، وەرگێڕانی سەباح مورادی، لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، چاپی یەکەم، ٢٠٠٩

٣.مامۆستای باش وسەرکەوتوو کێیە؟ محەمەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١٠.

٤.کارگێڕی بە چیرۆك، نووسینی عادل ئێخانی، چاپی دووەم، ٢٠١٢

٥.هەنگاو بەرەو سەرکەوتن، نووسینی خالید ئێرتوغرۆڵ، وەرگێڕانی شاگوڵ جەلال، چاپی دووەم ٢٠١٢

٦.مرۆڤی سەرکەوتوو کێ چۆن؟عدنان محمودالبزاز،و: سەروەر حەسەن، لە چاپکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی رێنما، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٨.

٧.گەشبینی گرنگترین رێگای بەختەوەری تۆیە، ئەنوەر ئەحمەد مستەفا، چاپخانەی گوڵ، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٧

٨.سایکۆلۆژیای رێنمایکردنی دەروونی، د.کەریم شەریف قەرەچەتانی، لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٥.

٩.شەش کتێب لە یەك بەرگدا، د.ئیبراهیم فەقێ، و: تاڤانە عمر، چاپەمەنی سایە، ساڵی ٢٠١٠.

١٠. ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە لە پەروەردە و فێرکردنی قوتابیدا، محەمەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٥.

١١. لێکتێگەیشتن لە ژیانی هاوسەرگیریدا،د. مأمون مبیض، وەرگێڕانی هونەر مولود حسین، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٤

١٢. وتەکانی ژیان، گۆڕین و ئامادەکردنی محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە، نارین، چاپی چوارەم، ساڵی ٢٠١٠
١٣. کێشە ئاکاری و دەروونییەکانی منداڵ، وەرگێڕانی محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەلات، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١١.
١٤. 1001وانە، ئامادە و کۆکردنەوەی ڕێبین خالس، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ساڵی ٢٠١٤
١٥. ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە لە نەهێشتنی توندوتیژیدا، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەلات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٢.
١٦. ڕازی سەرکەوتن، نووسینی هادی المدرسی، وەرگێڕانی منیرە ڕەئوف واژەیی، لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، چاپخانەی کەنج، ساڵی٢٠١٣
١٧. دەروونناسییا زارۆکان، حسین نەجاتی، وەرگێڕانی محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەلات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٣.
١٨. پەیوەندی دنافبەرا مامۆستای و قوتابیدا، هاییم گینات، وەرگێڕانی محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەلات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٥.
١٩. هەراسانکردنی منداڵ لە نێوان ماڵ و قوتابخانەدا، فایەق سەعید، بڵاوکراوەکانی ئاراس، چاپی یەکەم، ساڵی چاپ ٢٠٠٧
٢٠. گرفتە دەروونییەکان(پێشنیار و هەواڵ بۆ چارەسەر)تەها محەمەد ئەمین، بڵاوکراوەی ئاراس، چاپی یەکەم، ساڵی چاپ ٢٠١٢
٢١. دیاردە توندوتیژییەکان لای منداڵان و تازە پێگەیشتوان، ڕێگاکانی ڕووبەڕووبوونەوە،د. باری ماك ئامارا و فرانسیس مەك ئامارا، وەرگێڕانی بۆ کوردی محەمەد هەڵەبجەیی، دار الفکر، بیروت، چاپی یەکەم ٢٠٠٩
٢٢. ڕێبەری قوتابخانەی هاورێی منداڵ لە کوردستان، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٣.

٢٣. گۆڤارەکانی بڕیار
٢٤. ئەنتەرنێت

## سەرچاوە فارسییەکان

٢٥. صد راز موفقيت در زندگی زناشويی، نفيسه معتكف، ناشر درسا، چاپ هفتم، سال چاپ ١٣٩٢
٢٦. چگونه با كودكان رفتار كنيم، دكتر گارير،دكتر محمد ولی سهامی، تهران، انتشارات مرواريد چاپ سی و دوم، ساب ١٣٨٩
٢٧. بچه‌هارا چگونه تربيت كنيم، كاظم زاده، انتشارات اقبال سال ١٣٥٨
٢٨. جامعه و تعليم و تربيت، دكتور علی شريعتمداری، چاپ سوم، سال ١٣٤٨

## سەرچاوە عەرەبییەکان

٢٩.الكذب لدى الطفل و علاجه، دكتورمحمد حسن غانم، المكتبة المصرية، سنة ٢٠٠٦
٣٠.تربية الطفل فی الاسلام، الدكتورة حنان عبدالحميد العنانی، دار الصفاء للنشر و التوزيع، الطبعة الاولی، سنة ٢٠٠١

## پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر:

١.فەرهەنگی کانی (کوردی-کوردی)

٢.هونەرێ پەیڤینێ

٣.2000پەند ژ جیهانێ

٤.هونەرێ نڤیسینێ

٥.دەروونناسیا زارۆکان (دەروونزانی)

٦.گەڕیان ل دیف بەختەوەریێ

٧.پەیوەندی دناڤبەرا مامۆستای و قوتابیدا

٨.کلیلەکانی سەرکەوتن.

٩.کێشە ناکاری و دەروونییەکانی منداڵ

١٠.ناریشین ناکاری و دەروونی یێن زارۆکی

١١.رەوشەنبیر کییە؟

١٢.خەزینا زانستی- بەرگێ یەکێ

١٣.خەزینا زانستی - بەرگێ دوویێ

١٤.مامۆستای باش و سەرکەوتوو کێیە؟ کرمانجی خواروو

١٥.مامۆستایێ باش و سەرکەفتی کییە؟ (کرمانجی)

١٦.رۆژنامەنووسی پرۆفیشناڵ و ئیتیکی رۆژنامەوانی

١٧.هونەری خوێندنەوە، ١٤٠ کلیل بۆ سەرکەوتنی قوتابی لە قوتابخانەدا

١٨.140کلیل بۆ سەرکەفتنا قوتابی ل قوتابخانێ

١٩.خاڵخاڵۆك (هەڵبەستی منداڵان)

٢٠.کارگێڕیی قوتابخانە و بەڕێوەبەری سەرکەوتوو کرمانجی خواروو

٢١.کارگێڕیا قوتابخانێ و ڕێڤەبەرێ سەرکەفتی (کرمانجی)

٢٢.بنەما و ئادابەکانی دان وستاندن

٢٣.هونەرێ دان وستاندنێ (چەوا جوان دان و ستاندنێ بکەین)؟

٢٤.حەفت سەیر و سەمەرەکانی جیهان

٢٥.فەرهەنگی ڕەسەن(بەرگی یەکەم)
٢٦.فەرهەنگی ڕەسەن(بەرگی دووەم)
٢٧.قەیرانی کەم خوێندنەوە لە کوردستان
٢٨.ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە لە ڕیشەکێشکردنی توندوتیژیدا
٢٩.ڕۆڵێ مالباتێ و قوتابخانێ د بنەبڕکرنا توندوتیژییێدا (کرمانجی)
٣٠.پەندێن ژیانێ ژ گۆتنێن زانا و ناڤدارێن جیهانێ
٣١.نەڵند (١٠٠) سروود و هۆزانێن زارۆکان (شیعری منداڵان)
٣٢.ڕێبەرێ هشیارکرنێ ژ مەترسیێن مین و تەقەمەنیا
٣٣.سەرهاتیا هرچێ وجۆتیاری (چیرۆکەشیعر).
٣٤.ڕێبەری قوتابخانەی هاوڕێی منداڵ لە هەرێمی کوردستان
٣٥.سپاردە چییە؟
٣٦.پەروەردەوفێرکردنی منداڵ لە ئیسلامدا.
٣٧.پەروەردەو فێرکرنا زارۆکی دئیسلامێدا.
٣٨.ستەم لە تەرازووی ئیسلامدا.
٣٩. ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە لە پەروەردە و فێرکردنی قوتابیدا (سۆرانی) .
٤٠. ڕۆڵێ ماڵباتێ و قوتابخانێ دپەروەردە و فێرکرنا قوتابیدا (بادینی) .
٤١. ڕێبەرا قوتبخانا دۆستا زارۆکی ل هەرێما کوردستانێ
٤٢. هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان، نووسینی محەمەدساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، ساڵی ٢٠١٦.
٤٣. هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان، نووسینی محەمەدساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، بەرگی دووەم، ساڵی ٢٠١٦.